# سۆكرات

نوسینی: اندریە کریسون

وەرگێڕ بۆ عەرەبی: د. بشارە صارجی

وەرگێڕانی بۆ کوردی: ڕەحیم سابیر

چاپی یەکەم

سلێمانی ........................................ ٢٠٠٥

لەبڵاوكراو [illegible] خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە(٤٢)

**ناسامەی کتێب**

ناوی کتێب: سۆکرات

بابەت: فەلسەفی

نوسینی: اندریە کریسون

وەرگێڕ بۆ عەرەبی: د. بشارە صارجی

وەرگێڕانی بۆ کوردی: رەحیم سابیر

شوێنەچاپ: چاپخانەی [illegible]

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

دیزاینی بەرگ [illegible] نەخشەسازی: فوادکەولۆسی

ساڵی چاپ : ٢٠٠٥

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٩٢٩)ساڵی ٢٠٠٥ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

## پێشکەشە :-

- بەو ڕۆحە پاكو بێ گەردە نەمرەی (خاتوزین)ی نەنکم کەهەر لەمنداڵیەوە بەئەفسانەو داستانو چیرۆكو مەتەڵو پەندی پێشینانی کوردی گۆشی کردم.
- بەوکەسەی ئەم کتێبەی بۆ تایپ کردم.
- بەوکەسانەی دەیانەوێت خۆیان بناسن.

# ژیان:■

فەلسەفە خۆ ئامادەكردنە بۆ مەرگ

"سۆكرات"

دوو هۆكار هەن وا دەكەن كە ناسینی ژیانێك بە نەزانراوی بمێنێتەوە ئەویش كەمی ئەو بەڵگەنامە سەلێندراوانەی كە پێشوو هەبوون هەروەها بوونی ئەفسانەو ئەو چیرۆكە پڕو پوچانەی كە دەوروبەری رووداوەكانیان دابوو، ئێمە هیچ شتێك دەربارەی ژیانی پادشاكانی یەكەمی حەبەشە نازانین، بۆ هۆكاری یەكەمو دووەم زەحمەتە بزانین ژیانی (رومولوس)، كاتێ دەمانەوێ ژیانی سوكرات بنوسینەوە بیرمان بۆ لای هۆكاری دووەمدا دەچێت، هیچ فەیلەسوفێك ئەوندە ناوبانگی دەرنەكرد، هیچ كەسێك ئەوەندە جێگای سورسوڕمان نەبووە، رۆشنگەرو بڕوا بەخۆبووە، بەڵام زۆر ئەفسانەیان هۆینەوە دەربارەی ژیانو كەسایەتی، راستییەكان زۆرترن لەقەڵبەكانی دەربارەی ژیانی، خاوەن رۆشنایی یەك بوو وەك قەشەكانی ئایینی كاتۆلیكی كە هەیان بوو، بارێگا بكەینەوە بۆ ئەو مێژووە راستەی كە زانیاریمان پێ دەبەخشێ سەبارەت بەسوكرات، ئەفلاتۆنو كسینوفونو دیوجین لایرس دەبنە سەرچاوەیەكی گرنگو بایەخدار بۆ ناسینی سوكرات، بەڵام دەبێ زۆر ئاگاداری ئەو چیرۆكە دەماو دەمانە بین كە دیوجین لایرس باسیانی لێوە كردووە، لەساڵی ٢٤٠ (دوای مەسیح)ی نووسی واتە زیاتر لەشەش سەدە بەدوای مردنی سوكرات، كەوابێ دەبێ زۆر بە وورباییەوە ئەو قسانەی وەرگرین، ناچار دەبین كردارێكی ماتماتیكی وورد بین بگرینە بەر بۆ دانانی مێژووی لەدایك بوونی

سوكرات، دەقەكان یەكن دەربارەی سەلماندنی ئەوەی كە لەسالّی ٣٩٩ پ. ز ناچار كرا ژەهر خوارد بكرێ بەپێی فەرمانێكی ستەمكارانە لەو سالّەدا تەمەنی سوكرات ٧١ سالّ بوو،

لەمەش ئەو ئانجامگیریەمان دەست دەكەوێ كە سوكرات لەسالّی ٤٧٠ پ. ز لەدایك بووە، بێ ئەوەی بە ووردی مێژوو رۆژو مانگی لەدایك بوونی بزانین، ئەفلاتۆنیەكان لەرۆژی شەشی مانگی (تارگیلیون) یادیان كردەوە، واتە مانگی نیسان یان سەرەتای مانگی پێنج دەگەیەنێ، لەوانەیە پاساو هەبێ بۆ ئەم رەفتارە بەلاّم مەحالّە تا ئێستا هەستین بەلێكۆلّینەوەی زیاترو فراوانتر دەربارەی ئەو بابەتە، كەواتە سوكرات ژیانی لەسەدەی پێنجەمی پ. ز بەسەر بردووە، سەدەیەكی گرنگ بوو لەشارستانیەتی ئەگریكیو بەتایبەتی ئەسینادا، هاودەمی (بیركلیس) بوو كە تاسالّی ٤٢٠ ژیاوە، (فیدیاس) لەكاتی لاوێتیدا (برتینون)ی شاكاری تەواو كرد، بواری هەبوو كە گوێ بۆ تراژیدیاكانی (سوفوكلس)و (ئەور یبیدس)ی بلیمەتو گەورە بگرێ، (ئەریستۆفان)ی لەنزیكەوە ناسیوە، پەیوەندی پتەوی هەبووە لەگەلّ (ئەلسیبیاد)و ئەفلاتۆن یادەوەریەكانی لەبیرنەكردوەو نەمری كرد، لەوانەیە لەفەیلەسوفەكانی چەرخی خۆی وەك (برمینید)ش گفتو گۆی كردبێ بەهەرحالّ لەگەلّ دیارترین بیرمەندانی چەرخی خۆی پەیوەندی هەبووەو ناسیویانن وەك (ئەناكساگور)، كراتیل ی قوتابی هیرقلیط، لەسۆفسیێتەكانیش وەك بروتاگوراس، ئەیبیاس، برودیكوس، گورگیاس)، سەرەڕای ئەوە پەیوەندی هەبووە لەگەلّ زانایانی ماتماتیك، وەك فلكیین، زانایانی سروشت كە كەلّە رۆشنبیرانی هیلینی بوون لەو سەردەمەدا، دەزانین كە باوكی سوكرات ناوی (سفرونیسك) بوو كاری پەیكەر

تاشی دەكرد ، بەو پێیە لەوانە بووە سوكرات ئەو پیشەیە فێربوو بێ لەسەر زاری (دیوجین لایری) كە بەم شێوەیە بۆمانی دەگێڕێتەوە (دورس پەیكەرتاشێك بووەو ئەویش پەیكەری گراس)ی ئەكتەری دروست كردووە كە جلو بەرگی قەڵای ئەسینای پێ درا بوو، ئەمەش بواری بە (تیمون) دابوو كە بەگاڵتەجارییەوە باسی لێوە بكات لەم (گراس)ەوە ئەو پەیكەرتاشە هاتووە، یەكێك بوو لەو بیرمەندە یاسادانەرانە، ئەو لاوە یۆنانی‌یە، ئەو ساختە چییە ئەو فێڵبازە، ئەو گاڵتە جارە، ئەو نیو ئەسینی‌یەو مرۆڤە كپە، لەوانەشە نیوەی ئەمە راست بێت، سوودی زۆرمان وەرگرت كە زانیمان دایكی سوكرات ناوی (فیناریت) بوو پیشەیەكی مامانی بوو، لەوانەیە ئەم رەوشە كاریگەری زۆری كردبێتە سەر مێژووی بیروباوەڕەكان، سوكرات هەستی بەوەكردووە كە خۆی وەك مامۆستایەكی وانەوتنەوە سەیر نەدەكرد. بەڵكو وەك یاریدەدەرێكی لەدایك بوونی بیركردنەوە كە یارمەتی دۆزینەوەی ئەوەی لەكرۆكدا هەڵگیراوە بیدات، ئەم ئاكاوەكییە سەیرەو سەمەرە كە دواجار وای لەئەفلاتۆن كرد رێبازە بەناوبانگەكەی بهێنێتە گۆڕێ كە دەڵێ (زانین بێجگە لەیادكردنەوە) هیچی تر نیەو ئێمە هەر لەدایك بونمانەوە هەڵی دەگرین لەگەڵ خۆماندا بێ ئەوەی پێ بزانین، تێ گەیشتنە خۆبە خۆكان، گەر (فینایت) مامان نەبوایە ئایا ئەو رێبازە بەو شێوەیە ئەو گەشە سەیرەی دەكرد ، ئەو رۆشنبیریە چی بوو كە سوكرات لەلاویدا فێری بوو؟

پرسیارێكە تا ئێستاش لێڵی پێوە دیارە، سەرەڕای دۆخو واری خانەوادەكەی، ئەو شتانەی كە هەموو لاوێكی ئەسینی فێردەبوو فێربوو، سەرمان ناسوڕمێ لەوە، رەوشێكی وا ساكار هاتبووە ئاراوە كە ئاسان بووە بۆ بڵاوبونەوەی زانست، هەموو

شتێ: بەخراپی نەدەهاتە بەرچاو بەتایبەتی لەنێو ئەو سیستەمەی کە لەسەر پەرستنی بەربەیەت دامەزرابوو، لەلایەکی ترەوە کۆیلەکان هەموو کارێکی ناخۆش‌و زەحمەت‌و کۆیلەیی‌یان دەکرد، لاوە ئەگریکیە ئازادەکان ژیانی خۆشیان بەسەر دەبرد، کاتی زۆریان لەبەردەستدا بوو بۆ ئەوەی مەشقی هونەری زانست‌و هزر بکەن‌و فێری بن، خەڵك زۆربە لای ئەو مەشقانەدا نەدەچوون لەئەسینادا لەبەر زۆری مامۆستاکان‌و جۆری بیروباوەڕیان، هەندێ قوتابی ناچار دەبوون پارەبدەن بۆ ئەوەی فێربن، هەروەها لەنێوانیاندا هەندێ قوتابی هەبوون لەرێی راستەوخۆ بوایە یان بە خۆڕایی بوایە سوودیان لەوانەکان وەردەگرت، یان ناراستەوخۆ سوودیان دەکردو بەهۆی ئەو دیالۆگەك‌و گفت‌و گۆیەی لەگەڵ ئەو قوتابییانەی کە لەوانەکاندا ئامادە دەبوون، (دیالۆگەکانی ئەفلاتۆن)و (گفت‌و گۆ نەستەقەکان)ی کسیوفون وێنەی ئەو سەردەمەمان دێنێتە بەرچاو کە سوکرات پێش ئەوەی خەڵکی فێربکات یان فێرکرا بێت ئەوا خۆی فێربووە، هەموو لاوانی ئەسینا بەتایبەتی کوڕان مەشقێکی تەقەنی فێردەکران ئەمەش ئامادەکردنیان بوو بۆ ئەوەی ببنە سەربازی نیشتمان! مەشقی بەدەن، مەشقی سەربازی ژیرانە، سیستەمێکی تۆکمە، سروودی جەنگی بابەتیانە بۆ ئەوەی لەگەڵ دەروونی ا وێك بێ‌و دەروون بهەژێنێ، سەرەڕای ئەوەش هەندێ لەلاوان مەشقیان دەکرد بۆ بەشداری کردنیان لەیاری ئۆڵەمپیدا، پێشکەوتنی گالیسکەو هەڵدانی ئەستون‌و رم‌و کۆڵەمشتێ بەهەموو جۆرەکانیەوە، هەندێکیان ئەرشیفی لەبەرکراوی شاعیرو دانراوە تراژیدیاکان‌و گوتە بێژە هەزەلیەکانیان هەڵگرتبوو، سەرت دەسوڕمێ کە چۆن لاوێکی خاوەن بەهرەو خاوەن کەسیەتیەکی سەرکەوتو لەو رەوشەدا بتوانێ مەشقێکی چاك فێرببێت؟

بەهەموو بڕوایەکەوە سوکرات بەخت یاوەری بوو کە هاودەمی دوو مامۆستای فەیلەسوف بوو، گەر بڕوا بەو قسەیەی (دیوجین لایرس) بکەین کە دەنگدانەوەی هەندێ باو بوو، لەوانەشە سۆکرات قوتابی ئەناکساگور بوبێ دوای ئەوەی ئەو مامۆستایە بەهۆی بڕیارێکەوە ناچارکرا ئەسینا بەجێ بهێڵێ، دەبێ سوکرات هاتوچۆی قوتابخانەی ئەرکیلاوسی فیزیایی کردبێ، هەموو ئەوانە ئەو دەنگو باسانەن دەربارەی سوکرات باسیان لێوە کراوە، بەدەر لەوەش گوێ بیستی سەفسەتائیەکان بووە، لەگفتو گۆکانی (ئەفلاتۆن)دا دەردەکەوێو دووبارە دەکرێتەوە کە سوکرات قوتابی (برودیکوس)و بێ یەكو دوو (ئەلیبیاس)و (بروتاگوراس)و (گورگیاس)و (ئەنتیگون)ی ناسیوە، کە ئەفلاتۆنو کسینوفون ڕێبازو گفتو گۆکانیمان بۆ دەگێڕنەوە. بەهۆی ئەوەوەیە کە خەڵکان باوەڕیان پێ کردن، ئەمەش کاریکی زوری کردو زیانی گەیاند بە سوکرات ئەمەش دوای ئەوەی کارلەکارترازا، بادان بەوەدا بنێیت کە سوکراتی لاو زۆر بە باشی ناناسین، ئایا زانیاری باشترمان دەست دەکەوێ دەربارەی کاتی پیری، هەموو شاهیدەکان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ژیانی لەسەر ئەم دوو ڕێچکەیە بووە:-

یەکەم/ سوکرات خاوەنی خێزان بووەو هەندێکیان وا دەری دەخەنو وای بۆ دەچن کە خاوەن دوو ژن بووە،

بەڵام راستییەکەی سوکرات ژنێکی هەبوو ناوی (کسانتیب) بووەو زۆر هاروهاج بووە بەژنێکی تووڕەو هەڵەشە ناوبانگی دەرکرد بوو، با (خوان)ی کسینوفون بخوێنینەوە، (ئەنتیستین) یەکێك لەقوتابیانی سوکرات بووە گوێ بیستی ئەوە

بـووەو پێمـان رادەگەیـەنێ كـە زۆر شـت رودەدات لەپـەروەردەیی ژنـدا، بەسـەر سورمانەوە وتی (زۆر باشە سوكرات، ئەگەر ئەوە رای تۆ بێت، بۆچی لەبری ئەوەی لەگەڵیدا رابوێریت فێری ناكەیت، كە یەكێكە لـەو ژنانـەی كـە زۆر داخراون بەسەر خۆیاندا لەنێو ئەو هەموو ژنانەی كـە هـەن‌و لەوانەشـی دەبن‌و لەوانەشی دێن، سوكرات وەڵام دەداتەوەو دەڵێ (لەبەر ئەوەی ئەوانەی كە دەیانـەوێ سوار چاك بن لەهونەری سوارچاكیدا ئەوا باشترین ئەسـپ هەڵدەبـژێرن كـە تـاودار بێت نەك لەپێشەوە بێت، بەو بڕوایەیان گەر رازی نەكەن، ئەوا بە ئاسانی ئەوانی تـر دسپلین دەكەن، دەمویست هونەری ژیـان لەكۆمـەڵگاداو لـەنێو خەڵكیـدا فێـرببم، (كسانتیب)م هێنا بەباوەڕی خۆم گەر تەحەمولی بكەم ئەوا بە ئاسانی دەتوانێ خۆی لەگەڵ هەموو سروشتەكاندا بگونجێنێ، سوكرات خاوەنی سێ منداڵ بوو، دوانیـان هێشتا لەتەمەنێكی پێش وەخت بوون كە مردن. شاهیدەكان یەك دەنگن بەرامبـەر رەوشـی نالـەباری ئـابووری ژیـانی سـوكرات كـە تیایـدا ژیـاوە، بـەپێ‌ی قسـەی (كسـینوفون)ی ئـابووری گـەر هـەموو نرخـی كەلوپـەلی ماڵەكـەی كۆبكەینـەوە نەدەگەیشتە (٥٠٠ درخم)، كە بەشێكی زۆر كەمە لەدراوەكەمان! چۆن بەو شێوەیە بژێوی خۆی بەسەر دەبرد لەو رەوشەدا؟ بژێوی ئەو كاتە هەرزان بوو، خۆیی‌و مـاڵ‌و منداڵی بـژێویان خـاكی بـووە، بەسـاكاری ژیانیـان دەبـردە سـەر، لەگـەڵ ئەوەشـدا (دیوجین لایرس) سەرنجمان بۆ ئـەوە رادەكێشـێ، لـەزمان حـاڵی (ئەرستـۆكسـین ی كوڕی سبینتاكس)، كە سوكرات كەمە كەمە پارەی بە قـەرزو بەسوو وەردەگـرت‌و زۆرجار قەرزی دەكرد بـۆ ئـەوەی قەرزەكـە بگەڕێنێتـەوە لەلایـەكی تـرەوە (دیمـتری بیزەنتی) جەخت لەوەدەكاتەوە كە (كریتون)ی دەوڵەمەندو خاوەن پارە لەدوكانەكەی

لای بردو لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوەی فێری خوێندەواری زیاتر ببێ ئەمەش دوای ئەوەی کە بیروباوەڕەکانی سەرسامی کردن.

لەگەڵ ئەوەشدا سوکرات پارەی وەرنەدەگرت، دەقێك هەیە لەژیانی (ئەریستیب)ی دیو جین لابرس) وەگیراوە ئەو باوەڕە هەڵدەگرێ کە گومانی لێ ناکرێ سوکرات خەڵاتی بەرچاوی وەردەگرت ئەویش گەنم و شەراب بووە، بەهەر حاڵ هیچ پیشەیەکی کاسپی ڕێکخراو لای سوکرات بەدی ناکرێ، کاتێك ئەو ڕەوشە دێنێتە بەرچاو دەبینین، بەباشی ئەو هەڵچونە غەزەبیانەی لای کسانتبب هەن تێ دەگەین هۆی چی بووە، ئەوەش دەزانین ئەو سوکراتەی لەئەسینا لەدایك بووە هەمیشەش تیایدا ژیاوە، یەکەم گەشت کە پێی هەستاوەو لەئەسینا چووەتە دەرەوە ئەویش گەشتێك بوو بۆ (کورنثوس) بۆ ئامادەبوونی لەیاری (زۆران بازی) لەمەیدانی گشتیدا، لەهەندێ دوکانی هاوڕێکانیدا، یان کۆڵانان، لەژێر سێبەرو کۆڵەکەی پەیکەرەکاندا ژیانی دەگوزەراند، ژیانێکی پڕ لەگفت و گۆو دیالۆگ و فەلسەفیانەی دەبردە سەر، گەربمانەوێ ژیانی سوکرات باشتر بناسین، بابگەڕێینەوە بۆ ئەو گفت و گۆیانەی ئەفلاتۆن کە لە (خوان)دا باسی دەکات، ڕوداوەکە لای (ئاگاثون) بەرێوەچوو لەو ئێوارەیەداو بە بۆنەی خەڵاتەکەرە کردی بە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی تراژیدیایەیە کە مەکەیەوە، سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بۆ ڕۆژی دوایی هەندێ لەهاوڕێکانی بانگهێشت کرد بۆ کۆبونەوە، یەکێك لەو هاوڕێیانە سوکرات بوو کە نەفرەتی لەو دەکردو بەرێگاوە بوو (بۆ ماڵی لاوێکی جوان)، ئەو کۆمەڵە لەم کەسایەتیانە پێك هاتبوو (ئاگاثون) خۆیی و (ئەریستودیم) و (بوزانیاس) و (ئەریستوفان) و (ئەریکسماك) و (فیدری پزیشك) و هەندێ کەسی تر، لەبەر ئەوەی دوێنێ شەوی

رابـردوو زۆریـان خـوارد بـۆوه لـەنێوان خۆیاندائـەو شـەوه خواردنـەوەی شـەراییان قەدەغەکرد ، هەر یـەکێکیان لـەرێی خۆیـەوە چیرۆکی خۆشەویسـتیو پیاهەڵدانی دەگێڕنـەوە، بەمـەش کۆمـەڵێك گوتـاری بەهرەمەنـد کۆدەبێتـەوە لەلایـەن (فیـدر، بوزانیاس، ئەریکسیماك، ئەریستوفان)و سوکراتیش خۆی ڕووداوێك دەگێڕێتەوە کە ڕووی دابێت لەنێوان خۆییو (دیوپیم)ی ژنە قەشەدا، لەو ساتەدا لـەدەرگا دەدرێو لاوێـك دەرگاکـە دەکاتـەوە لـەدەرەوە دەنگـی (ئەلسـیبیاد) مـان گـوێ لـێ بـوو سەرخۆش بوو بەدەنگە بەرزەکەی ئەو ناوەی هەژاند بوو هاواری دەکردو دەیوت (کوا ئاگاثون، بمبەن بـۆ لای ئاگـاثـون! یـەك ڕاسـت دەسـتم دایـەبن بـاڵی لەگـەڵ کچـە بلۆیژەنەکەداو هەندێ لەهاوڕێکانی تری بردمانە بەردەم دەرگای هۆڵەکە ئـەو کاتـە کۆببوینەوە، ئەلسیبیاد ڕاوەستا، سەری خۆی بەچەپکە گوڵی وەنەوەشەو چڵو چـێو ڕازاندبۆوه، سەرەڕای ئەو حاڵەی کە ئەوی تیادا بوو لەسەر ئەو مێـزەی کـە تایبـەت بوو بـۆ خواردنـەوەی دانیشـت، لـەو حاڵەتـە بـێ هۆشـیو سەرخۆشـیەدا چیرۆکی سوکراتی بۆ دەگێڕاینەوە ئەوکەسەی لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو وای دەردەخسـت کـە ترسی لـێ نیشتووه، بەڵام بەم شێوەیە سوکراتی وێنا دەکرد کەسێکی سێ گۆشـە، سروشـتی، ژیرانـە، ئەفریـدە کراوێکـی سروشـتیانە، سـوکرات زۆر ناشـیرینە، وەك شۆشەیەکی وورگنی چەپەڵ وایە، بەڵام وەك ئەو شوشانەی کە ئاڵتونیان هەڵگرتبێ، (بەهەر حاڵ ئەی هاوڕێیانی ئازیز، بۆ ئەوەی ستایشـی سـوکرات بکـەم پێویسـتیم بەجیاکاری هەیە، ئەو وای دادەنێو لەوانەیە وابزانێ کەمن گاڵتە بکەم، بەڵام بۆتان دەردەخەم کە هیچ لەوقسانەی کە دەیڵێم پتەوتر نیە، لەسەرەتادا دەڵێم کە سوکرات بەڕاستی لەو (لەبەر ڕۆشتوانە) دەچێت کە لەشوێنی نمایشکردنی پەیکەر تاشەکان

كە هێمان بۆ ئەو هونەرمەندانەی شمشاڵیان بەدەستەوەیە. کاتێکیش دەیکەینەوە ئەوا خۆیان جیان بۆ دوو پارچەی ناوخۆ لەپێکهاتەیدا، لەناواخنیدا پەیکەری خوداوەندەکان دەبینین، هەروە هاوتی بەشێوەیەکی تایبەتو روکەشەوە لە (سێرمارسیاس) دەچێت وەك ئەوەی سوکرات خۆت بیت واشی دەبینم کە تۆ بەرپەرچی راستی ئەم قسەیە نادەیتەوە،

بێ پچڕان لەمێژووی کۆندا بابەتی ناشیرینی سوکرات هەیە، سەرێکی کەچەڵ، ناوچەوانێکی قۆقز، لوتێکی گەورەی ناشیرین، لەش پانو بەدەنێکی زل، پەیکەرتاشان ئەو واقیع حاڵەی سوکراتیان لەپەیکەرەکاندا بەدی دەکرد، بەلاّم لە (خوان)ی کسینوفون)دا دەبینین سوکرات بەگاڵتەوە باسی ناشیرینی خۆی دەکات لەبەشی پێنجەمدا لەسەر خەڵاتی جوانی رکابەری (کریتون) دەکات (ئایا تۆ ئەوەندە بایەخ بە بەها دەدەیت، ئەوەم بۆ بسەلێنە کە تۆ لەمن زیاتر جوانتریت، تەنها پێویستمان بەچرایەکە، با ئێستا ئەو کێشەیە کۆتایی پێ بهێنین، وەلاّم بدەرەوە ـ خۆت لێم بپرسە، ـ ئایا باوەڕت وایە کە تەنها جوانی لەمرۆڤدا هەیە یان لەشتی تریشدا هەیە، بێ گومان لەشتی تردا هەن، وەك ئەسپو گاو ئەو شتانەی کە زیندونین، ئەدی ناوترێ ئەوە گوللە بەندێکی جوانە دەتوانرێ شتەکان لەنێوخۆیاندا جیاوازیان هەبێو بەو پێیە جوان بێت؟ سروشت یان هونەر وای لێ کردووە کە بەکار بێت لەو پێناوەدا، ئایا ئەزانیت بۆ پێویستمان بەچاومان هەیە؟ دیارە بۆ بینین، مادامەکی شتەکەوایە کەواتە چاوەکانم جوانترە لەچاوەکانت ـ چۆن؟ لەبەر ئەوەی چاوەکانت تەنها یەك راستە هێڵی راست دەبینن، بەلاّم چاوەکانم ئەم لاو ئەولاش دەبینن لەبەر ئەوەی دەرپۆقیون بەپێی ئەو بۆ چوونەت قرژاڵ ئەو

ئاژەڵەیە كە خاوەنی جوانترین چاوە، بێ گومان لەبەر ئەوەی سروشت دووچاوی پێ بەخشیوە كە زۆربە هێزن! باوا بێ! بەڵام ئایا لوتت جوانترە لەلوتی مـن؟ ـ لوتم جوانترە گەر ئەوە راست بێت كە خوداوەند لوتی بۆ ئەوە پێ داوین كە بۆن بكات، هەر دوو كونی لوتت ئاراستەی زەوی بوون، بەڵام كونەكانی لوتم بەشێوەیەك بەرەو سەرووە كە بتوانێ لەهەموو لایەكەوە بۆن بكات؟، بەڵام لوتێكی چەماوە ـ جوانترە لەلوتێكی رێك؟ لەبەر ئەوەی لەبری ئەوەی ببێتە بەربەستێك یاریدەی هەر دووچاو دەدات بۆ بینین پێش ئەوەی ئارەزووی بینین بكات بەڵام لوتی بەرز نێوان جودا دەكاتەوە هەر وەك ئەوەی ئامادەكرا بێت و ببێتە بەر بەستێك لەنێوانیاندا، ئەم گاڵتەیە برەوی پێ دەدرێ لە بۆچونەكاندا واتە لەو بابەتە كلاسیكیەدا، دەروونێكی جوان لەبەدەنێكی ناشیریندا گەر ئەگریكیەكان بەو شێوەیە جوانی نێرینەیان لاخۆشەویست نەبوایە، لاو، رووتو قوت، خاوەنی هەستێكی دلڕفێن بوون بۆ جوانی، بێ گومان ئەوا رقیان لەو بەدەنە ناشیرینە دەبۆوە! (ئەلسیبیاد) ئاماژەو ستایشی ئەم جوانیانە دەكات لەقسەكانیدا، هەموو جوانیو ژیری سۆكرات لەوەدا دەردەكەوێ كە ئەو مرۆڤەیە بانگەشەی ئەوە دەكات كە هیچ شتێ نازانێ، لەوانەیە تەنها هەندێ خۆشەویستی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەكۆتایی هەموو گفتو گۆیەكدا بەڵگەكانی سەركەوتوانە دەبێت، ئەوە ئەو مرۆڤەیە كە زمان پاراوی فێرنەبووەو خۆی وا دەردەخات كە نامۆیە لێی، كاتێكیش قسە دەكات سەرنجی هەموو كەس بەلای خۆیدا رادەكێشێ وەك ئەوەی ساحیر بێت، لەولایەنەوە هەر وەك چۆن لەلایەن هەڵكەوتوی بە دەنیەوە لە (الستیرمارسیاس) دەچێ (ئەو كەسە بوو كە بە شتە جوانەكان خەڵكانی تەلیسم دەكرد لەو ئامێرەی كە پێی بوو بەڵام تاكە جیاوازی

كه لەنێوان تۆو مارسیاس دا هەیە ئەویش ئەوەیە كە تۆ ئامێریت، بەگفتو گۆی ساكارت هەمان شت ئەنجام دەدەیت، كاتێك گوێمان لەهەر قسەكەرێكی تر دەبێت، تەنانەت باشترین قسە زان، هیچ كەسێكمان هەڵگری ئەو كاریگەریەی تۆی نابێ بەڵام كاتێك گوێ بیستی تۆ دەبین بەتایبەتی تەنها خۆت بیت یان لەرێگای كەسێكەوە لەقسەكانت دەگێڕێتەوە چەندە گێڕەرەوە هەژار بێت لەهونەری دواندندا هەموو گوێ گران لەپیاوو ژنو لاو قسەكان كاریگەریان تێ دەكاتو وەك ئەوەی سحریان لێ كرابێ، ئەی هاورێیان بەلای منەوە، گەر نەترسابام لەوەی كە بەتەواوی خۆم پیشان دەم ئەوا سوێندم دەخوارد بەو رووداوە سەیرەی كە لەگفتو گۆكاندا بەدیم كر دبوو كە تاكو ئێستاكەش دەیانكاتو گوێ بیستیت بۆی،

وا هەست دەكەم كە دڵم زۆر بەتوندی لێ دەدا وەك ئەوەی كە ئارەزوویەك یان خۆشی‌یەكی سەمای قەشەیەك بم، بە ووشەكانی فرمێسك لەچاوم دێتە خوارێ، لەنزیك ئەم (مارسیاس)ەوە زۆرجار بەو كاریگەریە دەلەرزم، بەو دەبینم لەژیاندا وەك ئەوەی كە من دەژیم، زۆر تامەزرۆو كفت نەبوو بۆ ژیان، لەجیهاندا تەنها لەبەردەمی ئەودا كە كەس بڕوای پێ نەكات خۆمم تاقی كردەوە كە دەتوانم شەرمن بم لەبەردەم مرۆڤێكی تردا. شەرمەزار بوو بۆسەر نەكەوتنم لەرووبەڕوو بونەوەی ئەو دەستخەرۆییەدا هەروەها شەرمەزار بوو بەرامبەر دادپەروەریو ئازایەتیەكەی، هەندێ كەس دەتوانن گومان لەو دادپەروەریە بكەن، ئەویش كاتێك دەبینن سوكرات هەمیشە هەوڵ دەدات دوای جوانترین لاو بكەوێ، بەڵام ئەلسیبیاد بەهۆی تاقی كردنەوەی تایبەتی خۆیەوە دەزانێ، لەمەستیەكەی دەبورێ گەر رووداوەكانی چیرۆكێك بگێڕێتەوە كە دەتباتە نێو بەهەشت، ئەوەی سوكرات لەلاوە جوانەكانی

داوا دەکرد بەدەنیان نەبوو بەڵکو هەوڵ دان بوو بۆ ئەو هاوڕێیەتییەو متمانەیەی کە هەیانە، بەو پێکەوە ژیانە ڕێکخراو ڕێکخستنە، هەروەها ژیری تەواوی دروست بونیان، ئەلسیبیادە ئەمانە لەهەموو کەسێ باشتر دەزانێ، خۆی پێشکەش پێ کرد بەهەموو داواکاریەکانیەوەو نرخی ئەوەشی وەرگرت!،

چۆن هاوڕێیانی سوکرات هەڵگرتنی چەك لەرو لاوازی دەکردن؟

ئەلسیبیاد لەهەڵمەتی (بوتیدە) لەگەڵیدا بوو لە (هیلاکیدا)، ئەلسیبیاد دان بەوەدا دەنێ واتە لەخۆراگری‌و ئازایەتیدا لەهەموویان سەرکەوتوتر بوو، نەك تەنها بەسەر مندا بەڵکو بەسەر هەموو هاوڕێکانمدا، کاتێك نان هێنمر دوا دەکەوت ناچار بووین خۆمان راگرین بۆ ئەوەی ئازاری ئەو برسێتییە بگرین وەك سوکرات کە زۆرجار ئەمە لەکاتی هەڵمەتەکاندا رووی دەدا، ئەوانەی تەنیشتی کە لەلایەوە بوون توانای ئەو برسیەتیەیان نەدەگرت، کاتێك ئاسوودەو خۆشگوزەران بووین لەبەکارهێناندا نمونەو چالاکی خۆی دەردەخست، حەزی لەمەی خواردنەوە نەبوو گەر بەزۆر نەبوایە، گەر ناچارکرایە بۆمەی خواردنەوە ئەوا لەوانی زیاتر دەخواردەوە، سەرسوڕمێنەترین شت ئەوە بووە کە هیچ کەسێ لەجیهاندا نەیبینی سوکرات جارێك سەرخۆش بێت؟ ئەمەش بەڕای من لەم کاتەدا دەتوانن تاقی بکەنەوە، کاتێك وای پێویست دەکرد کە خۆمان لەسەرماو سۆڵەی زستان بپارێزین لەو شوێنەداو تەحەمولی ئەو کەشەبکەین. ئەو شتەی کە هەندێ جار سوکرات دەیکرد زۆر سەیر بوو، نمونە: لەماوەی سەرماو شەختەی زۆردا کاتێك کە کەس نەیدەوێرا لەسەریازگەکە بچێتە دەرەوە یان کە هەندێ کەس دەچوونە دەرەوە پۆشاکێکی گەرمیان لەبەردەکردو‌و هەر دووقاچیان بەلبادو پێستی ئاژەڵ دادەپۆشی سوکرات

حەزی بەوە نەدەكرد كە لەرۆشتن‌و هاتندا پاڵتۆ لەبەر بكات‌و بە پێ‌ی پەتی بەناو بەفردا دەهات‌و دەچوو ئەمەش ئارامی بەئێمەی شەحاتە لەپێ دەبەخشی) ئازایەتی سوكرات لەكاری سەربازیدا كەم نەبووە، لێرەدا ئەلسیبیاد وەك شاهێدێك دەدوێ، (بوتیدە)و (ئەمنیولیس)و (دالیوم)ی بینی كاتێك لەو بارەیەوە بەسەر هاتەكەی بۆ پێشەواكان دەگێڕایەوە، تەواو خۆم بەقەرزاری ژیانی ئەو دەزانم، كاتێك بەزامداری بینینی بەهیچ جۆرێك جێ‌ی نەهێشتم‌و توانی خۆم‌و چەكەكەشم رزگار كات لەدەستی دوژمن،

شتێكی تر هەیە كە سەرنج راكێشەرە لەرەفتاری سوكراتدا ئەویش كشانەوەی ئەرتەشەكەمان بوو ئەو كاتەی لەبەرامبەر (دالیوم) تێك شكاو هەڵهات، هەر لەسەرەتاوە ئاگاداری ئەوە بووم كە دەست پێشخەری ئەوەی ئەكرد كە پێش لاشیس بكەوێت‌و بینینم وەك تۆ ئەریستۆفان قسەی دەكرد وەك ئەوەی لەسەر شەقامەكانی ئەسینادا بێ قنج دەڕوات‌و بەچاوێكی سوكەوە سەیر دەكات، لەسەرخۆ لەپیاوەكانمان‌و دوژمن دەڕوانیێ‌و وا خۆی دەنوان كە چیرۆك خوان‌و قەرزاربارەكان خۆراگرین‌و وەك پیاوێك كە هەر كەسێك لێ‌یان نزیك ببوایەتەوە پێشوازیەكی گەرمی لێ دەكرا،

ئەو شتەی سوكرات دەیكات بەشێوەیەكی جوان دەیكرد، دوای (بوتیدە) ئەلسیبیاد دەڵێ (ئەی سوكرات لای سەرهەنگەكان زۆر پێم داگرت‌و داوام كرد بۆ ئەوەی خەلاتم كەن، تۆ پێش ئەوان كەوتیت بۆ ئەوەی كە پێویستە بۆ خۆت بێت بیدەیتەوە بە من بەو شێوەیەو بەو رۆحەوە سوكرات بەكارەكانی خۆی هەڵدەستێ بەلام بۆ سەفستائیەكان بەرامبەر وانە رەوانیەكانیان پارەیەكی زۆر داوا دەكەن‌و وەری

دەگرن ئەو بەهیچ شێوەیەك بە پارەی موكافەئە رازی نەبووە، بەراستیش ئەوەیە سوكرات رەوان نیەو شتێكی ترە لەپۆلێنیێكی ترو باشتر، گوتارەكانی لە (سیلین) دەچێ كاتێك دەمانەوێ گوێ بیستی بین دەكرێتەوە، وا پێ دەچێ لەسەرەتادا ئەوەی دەیلێ هەزەلیو گاڵتەجاڕی نەبێ؟

بیروباوەڕی بەشێوەی داپۆشراو بەفۆنەتیكیو گوزارشتی توند دەردەبڕی وەك ئەوەی لەپێستی ئابروداریكی بێزارو دابێتو قسەكانی تەنیا لەسەر كەری زرێی پۆش بێتو دەربارەی ئاسنگەرەكان بێت، دەربارەی دەباغەكان، وەك ئەوە وایە كە هەمیشە هەمان ئەو شتە بڵێتەوە لەهەمان فۆنەتیكدا،

بە جۆرێك كە وا چ نەزانو چ گەمژەیەك بیر نەكەنەوە لەگاڵتە پێ كردنی، باگفتو گۆكانی بكەینەوەو بچینە نێویانەوە، هەر لەسەرتادا وا دەركی پێ دەكەین كە پڕن لەمانا دوایی لەناوەڕۆكدا هەمووی خوداوەندیانە بوو، جوانترین وێنەی فەزیلەتە، گەر هەر كەسێك بیەوێ بیخاتە بەرچاوی خۆیو بیەوێ ببێتە مرۆڤێكی كامڵ، سۆكرات ئەو پیاوەیە كە ئەفلاتۆن بۆمانی وێنا دەكات لەزمانی ئەلسیبیادی سەرخۆشو راستگۆوە، گاڵتەجاڕو خاوەن هەستی توندەوە، هەندێ شتی نامۆ لەم پیاوەوە دەردەچوو.

دوو شتی نامۆ لەوانە سەرنجمان رادەكێشن.

یەكەم/ هەندێ جار زەینی تووشی بەربڵاوی دەبوو كەزانستی دەروونناسی هاوچەرخ پێی دەڵێ فیزیولۆژی كاتێك بیرێكی بۆ دەهات وەك خۆی بێ جوڵە دەمایەوە، گیل دەبوو لەهەموو شتێك وەك نوستویەكی موگناتیسكراو، كاتێك تووشی ئەو رەوشە بوو یان كاتێك ئەو حاڵەتە رووی دا كە لەگەڵ (ئەریستودیم)دا

بەرەو (خوان) دەچوو ئەمەش هۆی ئەو دواکەوتنە بوو کە (ئاگاتون)ی گەورە ماڵی تورەکرد، هەر وەك چۆن (ئەلسیبیاد) توانی بەهۆی بابەتێکەوە بە تێڕامانەوە لەجێگای خۆی بەبێ جوڵە راوەستا بوو، ئەو شتەی کە بەدوایدا دەگەڕا نەیدەدۆزییەوە، بەهیچ شێوەیەك

نەدەجولایەوە، بەبیرکردنەوەیەکی دانە بڕاو لەو رەوشەداو بەو شێوەیە مایەوە، نیوەڕۆهات: خەڵك بەسەرسوڕمانەوە چاودێریان دەکردو هەندێکیان بەوانی تریان دەوت سوکرات لەبەیانیەوە ئێرەی بەجێ نەهێشتووە، دوای نان خواردنی ئێوارە سەربازەکانی (ئەیونیون) خێزانەکانیان هێنا بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی لەو دەشتە شەو بەسەر بەرن و بخەون، (لەبەر ئەوەی وەرزی هاوین بوو) شەو چاودێری سوکراتیان دەکرد کە لەهەمان حاڵەت و رەوشی خۆیدا بوو، سوکرات تا بەیانی خۆرهەڵات بەراوەستاوی مایەوە دوای ئەوەی نوێژی بۆ خۆر کرد کشایە دواوە، لەلایەکی ترەوە دەربارەی (جنۆکە) تایبەتیەکەی خۆی دەدواو قسەکانی دووبارە دەکردەوە، کاتێك مەیلی دەبێ بەلای شتێکی تا بۆدا ئەو جنۆکەیەی ئاگاداری دەکاتەوە، گەر بۆ کارێکی ستەم بێت یان بۆ ئیشێکی بێزار بێت ئەوا دەیخاتە پێناو بەرژەوەندی خۆی یان بەرژەوەندی گشتی، ئایا سۆکرات بەراستی ئیمانی بەو جنۆکەیەو دەست تێوەردانی هەبووە؟ کاتێك دەربارەی ئەوە دەدوا، لەکۆتاییدا پێچەوانەکەیمان دەبینی بەشێوازێکی تر و گاڵتە جارانە هەڵس و کەوتی دەکرد، بەشێوەیەك ئاماژەی گوزارشتی سەرزمانمانی دەکرد، فۆنەتیکێکی (رەمەکی)یە کاتێك کە بیردەکەینەوە لەرەمەکی دروستبون کە هەندێ کردارمان لێ قەدەغە دەکات، یان بەفۆنەتیکی

هەستی ناوەکی ناومان ناو ناماقولانە تێمان روانی ئەوا لەکاتی رەفتارماندا کۆنترۆڵمان دەکات،

لەهەندێ چرکەساتداو بێ بیرکردنەوە لەکار رای دەوەستاندین هیچ گریمانەنەك رەچاو نەکراوە دەربارەی ئەم بابەتە،

لەفەرەزیەکانی راڤەکاراندا کە دەنگی جنۆکەکەی سوکراتیان بە وڕێنەیەکی تەواو دەزانی، تەنانەت بۆچونەکانی ئەو ڕاڤەکارانەی کە تەنها قسەکانی بۆ خۆشیو گاڵتەو گەپ سەیریان دەکرد. ئاگاداری هەندێ ووردەکاری ئەو بابەتە دەبین کە، سوکرات هەندێ لەبڕیارەکانی دەگەڕێنێتەوە بۆ دەنگی جنۆکەکەی، یەکێك لەوانە وەك نمونە بێ بایەخ دانی بوونی بۆ بەرگری کردن لەخۆیو رێگە پێ نەدانی خۆی بوو بۆ هەڵنەهاتنی لەبەندیخانەو گەوار کردنی ئەو مردنەی کە دەیتوانی درێژە بە ژیانی بدات، بێ گومان ئەم روخسارانە بەس بوون بۆ ئەوەی سوکرات ببێتە کەسایەتیەکی دیارو ناودار، لەلایەنی دەوروبەرەکەیەوە پەرۆشی رێكو پێکیو هەروەها بەجوان بێژیو جیاوازکانیەوە، دەمو چاوێکی رەسەنو سادە بەپێ پەتیەکەیەوە کە بەراستی دیاردەیەکی مرۆڤایەتی سەرسوڕهێنەرە هەروەها باپاڵتۆ کۆنەکەیەوەو گاڵتە جاڕیەکەیەوە هەروەها بەبێ زار بوونی بەو شتانەی کە خەڵکان بەرزیان دەکەنەوە، وەك پارەو توانایيو ناوبانگ دەرکردن، زیاتر لەوە سەرسوڕمان تر ئەوە بوو ئەو کاتەی کە پرسیاریان لە (دلف)ی قەشە کرد کە چ کەسێك حەکیمترە لەنێو خەڵکدا، ناوی سوکراتی هێنا؟ زۆر پێویستە کە بڕوا بەو گوێزانەوەیە بکەین کە لەکتێبی (بەرگری) (ئەفلاتۆن)دا هاتووە، بۆ جەخت کردنەوە لەبەهای ئەو بڕیارە، سوکرات وەك خوی هەمیشە پرسیاری یەك لەدوای

یەك دەكرد؟ بە هەرحاڵ، بانگەشەكەی ئەو قەشەیە دەنگی دایەوە، بەراستیو بێ گومان ئەو بانگەشەیە كاریگەری گەورەی كردە سەر دەستەبەر كردنی سەركەوتنی سوكرات، ئەو مرۆڤە جیاوازەی كە لەوان دەچێو ناوبانگیان بە (كلبیین) دەرچووەو یەكێك نەبووە لەوان، چۆنو بە چ شێوەیەك كاتی خۆی بەسەر دەبرد؟ زۆربەی كاتەكانی نیوەڕۆی بە گفتو گۆوە بەسەر دەبرد (دەتوانین جەخت لەوە بكەینەوە)، كسینوفون دەنوسێو دەڵێ هەموو ژیانی سوكرات گشتی بوو بەیانیان لەباخو یاریگاكاندا بەسەری دەبردو پیاسەی دەكرد بەدرێژایی كات لەو مەیدانەدا دەبینرا، ئەو مەیدانەی كە گەل جار جار سەردانی دەكرد، ئەو ساتانە شی كە لەرۆژگارێكی دوورو درێژ دەمانەوە، بۆ ئەو كۆڕو كۆمەڵەیەی كە كۆدەبونەوە قسەی دەكرد، گەر كەسێك بیویستایە گوێی، لێ بگرێ ئەوا دەیتوانی لەو كۆڕەدا گوێی لێ بگرێ خیتابی نەدەدا بەڵكو تەنها هەر قسەی دەكرد، پێویستی بەگفتوگۆ كەرێك هەبوو، هەموو مرۆڤێك دەیتوانی لەگەڵیدا بدوێو رۆڵ ببینێ هیچ بەربەستێكی لەبەردەمدا دانەدەنا نەتەمەن نە جیاوازی رەگەز نەباری ژیانو نەپیشەش، هیچ شتێكی وا نابینین كە ڕووناكی بخاتە سەر ئەم كارە، لیستی ناوی ئەو كەسانەی كە لەگەڵیدا دادەنیشتن گەر لای ئەفلاتۆن بوایە یان لای كسینوفون بوایە، ئەو لاوە بەخۆ وانەیكە خاوەنی رۆحێكی خاكیو جوان بوون وەك لیزیس، شرمید، ئەلسیبیاد، ئەو تیدم، ئەوانەی گفتوگۆكانی ئەفلاتۆنو یاداشتەكانی كسینوفون دەربارەی سوكرات ناویانی نەمركرد، هەندێ سۆفستائی رێباز جیاواز هەبوون وەك، ئەیبیاس، برونا‌گوراس، بروديكوس، هەندێ گوێ گری تر هەبوو كە بەدەست پاكیو دڵ پاكیبەوە گوێیان دەگرت، وەك ئەنتیستانو ئەرسیتیب، سەرهەنگێكو

لاشیس‌و فالچیه‌ك‌و ئه‌و تیگرون (كریتون)ی هاوڕێی دێرین‌و چاك هه‌روه‌ها شریگون وشریكرات له‌وێ بوون. هه‌روه‌ها دوو براش له‌وێ بون كه هه‌وڵی ده‌دا پێكیان بهێنێ، هه‌روه‌ها (لامبرو كلیس)ی بوغز له‌سك‌و رق هه‌ڵگر له‌كسانتیب كه سوكرات به باوك بانگی ده‌كرد، كریتوبوم ئه‌و كه‌سه‌ی كه پێویستی به‌رێنمایی هه‌بوو بۆ هه‌ڵبژاردنی هاورێكانی، هه‌روه‌ها ئه‌رستارك ئه‌و كه‌سه‌ی كه به كۆمه‌ڵه‌یه‌كی تا ڕاوگه‌وه خه‌ریك بوو بۆ دۆزینه‌وه‌ی جێگایه‌ك بۆ ئه‌و په‌نابه‌رانه‌و په‌یدا كردنی خواردن بۆیان، هه‌روه‌ها (ئه‌وثیر) كه سوكراتی هان ده‌دا بۆ كاركردن بۆ ئه‌وه‌ی پێی بژی، هه‌روه‌ها ثیودوت ئه‌و گۆرانی بێژه خۆشه‌ویسته كه پێویستی به‌هه‌ندێ ئامۆژگاری هه‌بوو ده‌رباره‌ی مه‌سه‌له‌ی هونه‌ری ده‌ست خه‌ڕۆیی‌و پاراستنی عاشقه‌كانی به‌ڵام بابه‌ته چاره‌سه‌ركراوه‌كان ئه‌وا جیاوازن‌و جودان! قسه زۆركرا له‌گه‌ڵ خه‌ڵكاندا! ده‌رباره‌ی ئه‌و شتانه‌ی كه وایان ده‌زانی ده‌زانن له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا نایزانن، هه‌روه‌ها ده‌رباره‌ی ئه‌و شتانه‌ی كه خه‌ڵكان ده‌یانه‌وێ بگه‌نه روونی ئه‌و بیروباوه‌ڕه تایبه‌تیه‌ی هه‌یانه، وه‌ك به‌ختیاری، حیكمه‌ت، رێك‌و پێكی، ئازایه‌تی، دادپه‌روه‌ری، په‌رستنی دروست، هه‌روه‌ها راستگۆیی، جوانی، نرخی یاساكان، بایه‌خی ده‌وڵه‌ت‌و رێگاكانی به‌رێوه‌بردنی، هه‌روه‌ها به‌های ئه‌و سۆزه گه‌رمانه، هونه‌ری خۆشه‌ویستی، هونه‌ری به‌خشین هه‌ندێك خۆیان له‌و بوارانه‌دا به‌پسپۆڕ نه‌ده‌زانی هه‌ندێكیش پێویستی به‌و فێربوونه نه‌بووه له‌و بوارانه‌دا؟ بۆ چاره‌سه‌ركردنی هێڵه جه‌وهه‌ریه‌كانی بیروباوه‌ڕو قسه فه‌ره‌زیه‌كانی سوكرات ده‌رباره‌ی ئه‌و بابه‌تانه، شتێكی تر هه‌یه ئه‌ویش كه گومانی تیادا نیه سوكرات لای گوێگرانی سه‌ركه‌وتنێكی مه‌زنی به‌ده‌ست هێنا، هاوكاری ده‌كردن بۆ دۆزینه‌وه‌ی

راستییەكان، بۆیە ئەو دەسەڵاتەی كە ئەو سەردەمە هەبوو رازی نەبوو لەسوكرات، ئەمەش وای لێ كرد كە ژیانی لەدەست دات، هەر ئەوەش بوو وای كرد كە ببێتە نمونە بۆ هەموو جیهان یەكەم شەهیدی بیروباوەڕی ئازادو فەلسەفە، سەردەمێك دێتە ئاراوە كە مەترسی بەشێوەیەكی تایبەتی لادەچێ لەسەر هەموو كەسێكی هەڵكەوتوو، ئەفسانەی (مێخو قامیش).

لێرەدائەو راستییە تاڵە روون دەبێتەوە بەشێوەیەك كە لەبیرنەچێتەوە. ئەویش كۆتایی سەدەی پێنجەمی پ. ز بوو كە لەو جۆرە شێوانە هەبوو لەئەسینادا واتە پیاوانی دەركەوتوو بەتوندی هەڕەشە یان لێ دەكرا! بە كورتی باسی ئەو سەردەمە دەكەین كە یۆنان پێیدا تێ پەڕی، لەساڵی ٤٩٠ پ. ز سەربازانی ئەسینا بەسەر (داریوس)ی فارسدا سەركەوتن لەجەنگی (ماراتون) لەساڵی ٤٨٠ پ. ز بەتالیۆنە دەریاوانەكانی یۆنانی كە لەسالامین كۆببونەوە پاپۆرەكانی كسیرسیس یان لەناوبرد لەساڵی ٤٧٢ ئەمەی دوایی بەهیلاكەت چوو، لەساڵی ٤٥٦ ئەسشیل دانەری تراژیدیای (سوارچاكان) مرد ، كە كاریگەریەكی زۆر گرنگی هەبوو كە لەمێژوو هەروەها لەئەدەبی یۆنانیدا لەبیرناكرێن، یەكێتی شارەكانی یۆنان گەر ئەو یەككگرتنە بەو شێوەیە بەردەوام بوایە توانای ئەگریكیەكان چۆن بەدی كرایە، بەڵام ئەو یەككگرتنە بەردەوام نەبوو لەدوای سەركەوتنەكانی یۆنان یەكسەر دوو سەنتەری جیاوازی شارستانیەت هەڵكەوت، سەنتەری ئەسینا لەلایەكەوەو سەنتەری لاسیدیمونا لەلایەكی ترەوە، ئەسینا دەبێتە شاری هونەرو ئەدەبو زانستو رەوان بێژیو بیركردنەوەی فەلسەفی، لەهەمان كاتیشدا دەبێتە شارێكی دەریایی گەورەو لەگەڵ دوورگەكانی ئەگریكو كۆلۆنیا هیلینیەكانو هەموو ئەو بەندەرانە كە نزیكن

لەئاسیاو ئەفریقیاوە، واتە پەیوەندیەکی گەورە پەیدا دەبێ لەو نێوەندەدا، بەتایبەتی پەیوەندیە بازرگانیە گەشە کردووەکان، ئەم کرانەوەیە وای کرد کە پێشوازی زۆر لەکەسایەتیە دەرکەوتووەکان بکەن، بەتایبەت لەبواری زانستو هونەری ڕەوانبێژیدا، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا دووچاری نەخۆشی کۆمەلاّیەتی بوون، هەولّدانی زۆر بۆ خۆشیو بەزمو ڕەزم، نەبوونی دیسپلینێکی کۆمەلاّیەتی دابەزینی دیاردەی ئاکار، مەیلێکی زۆر بۆ ڕەوانبێژیو قسەی زل، بە کورتی ئەو هەموو لێدانە درا لەو بنەما کۆمەلاّیەتیەی کە درەو شاوەترو جێی متمانەو بڕوا بوو بۆیاساکانی کرکورگ،

سبارت لەهەندێ بواردا پێشکەوتنی بەخۆوە بینی بەپێچەوانەی ئەسیناوە، لێرەوە هونەرو زانستو ئەدەبو فەلسەفا بەهای نەما، (ئەیلوت)ەکان کار بۆ چاکەی دەولّەت دەکەن، گەروانە بوایە ئەوا سزای مردنیان بەسەردا دەدرا،

هاولاّتیانی ئازاد بەژنو پیاوەوە مل کەچی ژیانی زەحمەتو سك هەلّگوشین دەبون، هەمو شتێ بەرەو ئامادەکردنی خەلّکانی جەنگاوەر دەچوو، مەشقی بەدەنی زۆر، مەشقی سەربازی، خوانی هاوبەش، چەسپاندنی دیسپلین لەهەموو ساتێکدا بۆ دابین کردنی ڕێز لای پیرەکانو ڕواقیەش لای لاوان، ئەنجام، سبارت دەبێتە شارێکی ڕێکخراوی سەربازی بە تواناو بەهەلّپە بۆسەربەخۆیی خۆی، بەهۆی باری زەمینەکەیەوەو شوێن هەلّکەوتوی ناوچەکەی زیاتر هەلّپەی دەکرد بۆ دەست بەسەراگرتن، لەدەرەوبەری شاری سبارت شاری بیلوبونیزی سەرەکی هەیە، هەروەها لەدەوروبەری ئەسیناشدا هەندێ شاری باکوری یۆنانو دوورگەی دەریای (ئیجە) هەیە، ئەم دووشارستانیەتە ڕووبەڕووی یەکترن بێ لەیەکتر گەیشتن، لەکۆتاییدا ڕقو

کینە سەرهەڵدەدات لەنێوان ئەو دوو شارستانیەتەدا، کاریگەری ئەو ململانێیە بەنهێنی دەمێنێتەوە لەژێر خۆڵەمێشدا تا ساڵی ٤٣١ واتە تا ئەو کاتەی جەنگ بەرپا بوو کە پێی دەڵێن جەنگی (بیلوبونیز) بەهۆی جیاوازی نێوان (کورنپوس)و (کورسیر) ئەم جەنگە لە ٤٣١ تا ٤٠٤ی خایاند، لاوێتی سوکرات درێژکراوەی ئەو قۆناغە گەشاوەی شارستانیەتی یۆنان بوو، دوای ٤٣١ ململانێی گەوجانە روو دەدات کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی هاوپەیمانە سەرکەوتووەکانی دوێنێ، ئەمەش بەهۆی برسێتیەوە ئەنجام دەدرێ دوای هەندێ رووداوی یەك لەدوای یەك دەبێتە هۆی وێران کردنی ئەسینای سیاسی.

گەر بمانەوێ وێنەی ئەو کەشەی ئەسینای تیا بوو وێنا بکەین ئەوا بەخوێندنەوەی گاڵتە جاڕیەکانی (ئەریستوفان) سوودێکی زۆر دەبینین، ریوایەتەکانی وێنەی گاڵتە جاڕیو گاڵتە پێ کردنێکی روونن بەو سەردەمەی یۆنان، قسەی زۆر گەورەی تیا بەدی دەکەین، بەڵام بابەتەکانی، نوکتەکانی، جنێوەکانی، شتە سەیرەکانی، رووبەڕووەکانی، بێ گومان ئەوانە هەموویان گوزارشت لەو بایەخدانەی ئەو سەردەمە دەکات، ئەو پرسیارەی لامان دروست دەبێو هەڵدەتۆقێ ئەویش ئەوەیە، ئایا ئیدارەی ئەسینا ئیدارەیەکی چاك بوو؟ بیرکلیرس بانگەشەی جەنگی (بلوبونیز)ی کرد بەڵام لەساڵی ٤٢٩ بە نەخۆشی پەتا بەناوبانگەکەی ئەسینا مرد، دوای ئەو (کلیون)ی سیاسیو دیما گۆجو بازرگانی دەلاڵی پێست هاتە سەر تەختەی شانۆی ئەسینا. ئامادە بوو بۆ هەموو بڕیار دراوێك وەك چۆن پشتی سەگ بخورێنێ ئاوەها پشتی گەلی دەخوراند.

پارەیەكی زۆری دابەش دەكرد بەسەر دەستو دایەرەكەی خۆیدا، ژیانو ئازادی ئەوانی تری لەبەردەم گەلدا دەكردە قوربانی. كەسێكی بێ ئابروو بوو، چەند كەسێكی بازرگانی جەنگ لەدەوری خڕببونەوە وەك ئەو جەنەراڵو میرانەی كە خۆیان بۆ هەڵبژاردن پاڵاوتبوو، دروست كەرانی چەك، ئەوانەی كەشتی جەنگیان دروست دەكرد، بازرگانەكان، پیلاو دروست كەری سەربازان، دوو رووسوومەند بوون لەداماوی گەل، هەموو بیرمەندە سەربلندەكان دژی (كلیون) بوون، ئەوانە بەهای ئاشتی ناكۆتایی‌یان دەزانی چەندە بۆیە هەمیشە هانایان دەبردە لای خوداوەندەكانو بلیمەتەكانی ئەو سەردەمە، كەس وەلامیان نەدەدانەوە؟، هەر بۆیە (ئەریستۆفان) بەناوی ئەوانەوە هاواری دەكرد بەهەموو هێزی خۆی، با (ئەرشانی)یەكانو سوارچاكان، ئاشتی،

بیسیستراتی، كۆمەڵەی ژنان، بخوێنینەوە، ئەمانە هەموو باسی لەعنەت كردنی جەنگ دەكات، ئەو جەنگە شێتەی هەموو شتێ دەڕمێنێ، ئەریستۆفان بەرووی گوزارشتی هۆكاری دارمانی دەردەخست، لەوانەش گرنگی نەدان بەپرۆگرامی پەروەردەیی كۆنو دیسپلینی كۆمەلایەتی هەروەها گەشەسەندنی سەفسە تائیەت كە بوار دەكاتەوە لەبەردەم ستەمێك كە وەك دادپەروەریەك سەیر بكرێتو دادپەرودریەك وەك ستەمێك سەیر بكرێت، هەروەها كینە لەو خوداوەندە باوانە تەنانەت نكوڵی كردن لەبونیان، ئەمانە دەبێت بەرەنگاری بكرێنەوە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ باوەگەورەكان كەسەر كەوتوانی ماراثونو سالامین پێی پەروەردە بوون، ئایا وای نابینی كە ئێمە گوێ لەسوكرات دەگرین قسە دەكات؟ هاوڕێكەم وتی كە واتە ئەتوانم، ئەی لاو كە هۆگرم بیت، منم كە دوای دادو ئاوەز كەوتوم،

دەرك بەوە دەكەيت كە چۆن لەگۆڕەپانی گشتی كەوبتەوە، وە لەگەرماوی لەش خاوبوونەوە وازبهێنیت، شەرم لەكارەكان بكەیتو زۆر تورە بیت گەر كەسێك گاڵتەی بە چاكەكەت كردو جێگاكەت بەجێ بهێڵیت بۆ بەساڵاچووەكان، ڕێزی دایكو باوكیشت بگرەو لەدواجاردا واز لەهەموو شتێكی خراپ بهێنیت، شەرم لەخۆت بكەو بەرووی دایكو باوكت هەڵمە شاخێو بە پڕو پوچی مامەڵەیان لەگەڵدا مەكەو تەمەنی بەخێوكەرت بەفیڕۆ مەدە.

خراپەكار وەڵامی بۆ ئەو قسانە ئەمەیە (گەر گوێی بۆ رانە گرم، بەباخوس قەسەم ئەوا ناوت دەنێن گەورەگە مژەكەی دایكی)، هاورێكە وەڵامی دەداتەوە، نەخێر، كاتی خۆت بەوەرزشەوە بەسەر دەبەیت كە هێزو تەندروستیت پێ دەبەخشێ؟ ناچیتە گۆڕەپانی گشتیو قسەی زۆر بكەیتو گفتوگۆ بكەیت هەر وەك خەڵكی لەم رۆژانەدا دەیكەن.... بەڵكو دەڕۆیت بۆ ئەكادیمیەكەو تاجە گوڵینەی سپیت لەسەر كردووەو لەگەڵ هاورێ چاكەكەی تەمەنت لەژێرداره زەیتونە پیرۆزەكاندا كاتی خۆشی بەسەر دەبەیت بۆنی ئەیفو گەڵای داربی نوێ هەڵدەمژیت.

ئایا سوكرات لەمەزیاتر ئامۆژگاری دەكرد؟ بەڵام بڕوانە ئەو شتە چاوەڕوان نەكراوە، ئەریستۆفان خودی خۆی ئەم قسەیە لەسەر زمانی هاورێكەی دەڵێو وای دەردەخات كە قسەی تایبەتی خۆی بێت، بەمەش لەسوكرات هەڵدەگەڕێتەوە خۆ دانە دەستی پێچەوانەیەكی سەیر لەوانەشە مەبەستدار بێت، دەچێت بۆ لای كۆمەڵە سۆفسەتائیەكانو بێژەرە ساختەچیەكان بەهونەری ستەمكاری لەبری دادپەروەری تاوانباری دەكات، پێوەرەكە پڕ بوو، لەكۆتایی (گیوم)دا داوای چەپلە لێدان دەكات بۆ (ستربسی) لەبەر ئەوەی ئەو ماڵەكەی سوكراتی سوتاندو هەموو كەلو پەلەكەی

گرِ تىَ بەردا، كە شيريفونو قوتابييانى مامۆستاكەشى تيا بوون، پەلامارو شالأوێكى چاوەڕوان نەكراو بوو بێ دەنگ نەدەبوو بۆ تورە كردنەوەى سوكرات (گيوم) لە ٤٢٤دا نمايش كراو ئەوجا لەسالّى ٣٩٩ بڕياردرا بەسەر سوكراتدا، ديار بوو لەنێوان سوكراتو ئەريستۆفاندا هيچ كێشەيەك رووى نەدا، لە (خوان)ى (ئەفلاتۆن)دا هەردووكيان بەيەكەوە دەردەكەون هەر نەبێ سوكرات هەستى بەو ژيريە دەكرد، بەو ژيريە ناو نەبراوە، لەگەلّ ئەوەشدا ئەو ساتانەى كە ئەسيناى تيادا دەژيا ئەم پێى تێك نەدەچوو بەلاّم برينداري دەكرد ئەو جەنگەى لەسالّى ٤٣١دا هەلّگيرسا بەراستى رووداوەكانى لەبارودۆخێكى ناخۆشدا بوو بۆ هەموو يۆنانيەكان، دلّتەزێن بوو بۆ ئەسينا، مێژوونوسان وەك سێ قۆناغ دياريان كردووە، لەسالّى ٤٣١ تا سالّى ٤٢١ كە سەركەوتنو دارِمانى بەخۆوە ببينىَ، هەموو سالّێكيش پێش دروێنە كردن بێستانەكانى (لاتيك)و لاكونيا) تالاّن دەكراو ئەگريكيەكان لەبرسانا دەمردن، سالّى ٤٢١ (نيسياس)و (سبارت) پەيمان دەبەستن بۆ ماوەى ٥٠ سالّ بەلاّم ئەو پەيمانە رێزى لىَ ناگيرىَو هەلّدەوەشێتەوە، قۆناغى دووەم سالّى ﴿٤٢١ ـ ٤١٢﴾ رەزامەندى درا بۆ هەلّمەتێكى بەهێز بەسەرۆكايەتى ئەلسيبياد دژى (سقليه) بۆ كێشەى ئەسيناو سەرهەنگەكەى ناچار بێو مل كەچ كات بۆ بە دوور خستنەوەى لەولاّت، قۆناغى سێهەم ﴿٤١٢ ـ ٤٠٤﴾ پێش هەموو شتێك بەتێك شكاندنى دەريايى بلوپونيز ناسرا لەدووركەى ئەرگينوز (٤٠٦) تەنها ئەم سەرنەكەوتنە بەس نەبوو، ميرەكانى سبارتى، ليساندر لەسالّى ٤٥ بە سەركەوتنى بەس نەبوو، ميرەكانى سبارتى، ليساندر لەسالّى ٤٥ بەسەركەوتنى (ئەيگوس ـ بوتاموس)و دەست بەسەر ئەسينادا دەگرىَ، شورا

روخاوەكان، كەشتىيە سوتاوەكان، داگيركراو بزر بووەكان، ئەمە بەيان كردنى ٢٧ ساڵەى جەنگى ئەسيناى گەشە كردو بوو، سى ساڵى ستەمكارى حكومەتى فەرزكراوى سەركەوتوانى دەخەينە سەر، زۆربەى ئەندامىيان، سبارتى بوون، هەندێ لەئەسينسيەكان چوونە پاڵيان لەوانە كريتياس، تيرامن، شاركليس، راستيش ئەوەيە كە فەرمانڕەواييان تەنها هەشت مانگ بوو، ساڵى ٤٠٣ (تراسيبول)ەكان دەريان كردن، گەر ئێمە بڕوا بەقسەكانى كسينوفون بكەين دەبينين كەخراپەو ستەمكاريان گەيشتە ترۆپك، ئەو پلانە شاراوەيەى كە سوكرات كرايە قوربانى، ئەم كردەوەيە دەگەڕێتەوە بۆ كردەوە دڕندەكانى هەندێكيان، لەواقيعدا لەنێوان سى ستەمكاردا (كريتياس) ديارەو دەردەكەوێ، ئەم مرۆڤە هەڵپەيە يەكێك بوو لەهاوڕێيانى‌سوكرات بەڵام بووە دەمە بۆڵەيان (ئايا سوكرات كريتياس ى ئاگادارنەكردەوە، كسينوفون دەنوسێ كە زۆر هۆگرى ئەو تيديم بوو؟ چەند جارێ باسەكەى بۆ دوو بارە كردەوە، كە شەرمەزارييەو نابێ پياوێكى ئازادو سەربەرز بچێت بۆ لاى خۆشەويستەكەيى‌و داواى لێ بكات رێزى لێ بگرێت؟ كريتياس نەترسا بۆ رێنمايى كردنى سوكرات‌و نەيتوانى مەيلە بۆگەنەكانى كۆنتڕۆڵ بكات، لەنێو خەڵكانێكى زۆردا كە ئەو تيديم يەكێك بوو لەوانە سوكراتى بە ئاژەڵە قێوەزنەكان وێك چوان بەمەش كريتياس بووە دوژمنى سەرسەختى سوكرات،

كاتێك كريتياس يەكێكى لەوسێ كەسە بەتايبەت هەڵبژارد بۆ دانانى ياساكان، يەكێك لەو ياسايانەى دانا كە دژى سوكرات بوو، نەهى لە (فێركردنى هونەرى قسەكردنە) دەكردو سۆكرات هيچ ئەرزشێكى بۆ دانە دەنا، بە توندى دژى ئەو سيستەمە راوەستا كەسى كەسە كە دەستيان دابويەو دەست پێشخەريان كرد لەو

سیستەمەو زۆر لەهاولاتیانی چاکیان لەسێ دارە دابوو، هەندێکی تریان ناچار دەکرد بۆ کاری تیرۆریستی، (سەرم دەسورمێ کە سوکرات دەڵێ، گەر شوانی مێگەل بەشێکیان سەر بڕیو بەشەکەی تریان لاوازکات ئەوەیش رەت کاتەوە کە شوانێکی بێ کارە، هەروەها سەرم لەوەش دەسورمێ گەر مرۆڤێك ببینم ببێتە بالا دەست بەسەر هاولاتیەکانیدا، لەگەڵ ئەوەشدا شەرم لەرەفتاری خۆی ناکات‌و دانی پیادا نانێ کە فەرمانڕەوایەکی ستەمکارە)، ئەم گفت‌وگۆیە دەگوێزینەوە (کریتیاس‌و شارکلیس) سوکراتیان بانگ کردو ملیان بۆ یاساکە چ پێ کردو فەرمانیشیان پێ دا کە ئیتر لەگەڵ لاوەکان بە هیچ جۆرێ گفت‌وگۆ نەکات (کریتیاس وەلامی دایەوە، ئەی سوکرات بیرت نەچێتەوە، پێویستە لەسەرت کە پینەچی‌یەکان‌و کانزا دروست کەرەکان‌و پیشەوەرەکانی تر دلخۆش کەیت؟

هەروەها وادێتە بەرچاومان کە ئەوان بێزار بوون لەهەموو گفت‌وگۆکان، بێ گومان سوکرات وەلام دەداتەوە، سوکرات وەلامی دایەوە، هەروەها گەیشتە ئەو ئەنجامگیریەی کە لەپیشەکانیاندا دەری دەکرد لەسەر مەسەلەی دادپەروەری‌و چاکەکاری؟ ـ شارکلیس وەلام دەداتەوە، بەلێ بزفس، شوانی مانگاکانت بخەرە ئەو لاوە دەنا پاشەرۆکانی لەنێو مێگەلەکەتدا دەدۆزیتەوە) سەرەتا سیمای وەك گێژەلۆکەیەك دەرئەکەوت لەگەڵ ئەوەشدا هەلنەدەچوو بەلکو دواجار هەلدەچوو لەسالی ٣٩٩ پ. ز سێ کەس هەستان بەدژایەتی کردنی سوکرات ئەنیتوس‌و میلیتوس ئەنیتوس یەکێك بوو لەوانەی ئیرەیی بە سوکرات دەبرد هەر ئەویش بوو (ئەریستۆفان)ی دژی سوکرات ووروژاند، هەر ئەویش بوو شیرینی دا بە (میلیتوس) کە شاعیرێکی تەمبەڵ‌و بێ بەهابوو، (لیکون)یش بێژەرێ: بوو کە

هەميشە ئارەزووی ئەوەی دەكرد كە لەدانيشتنەكاندا قسەی زل لەسەر خۆی بكاتو بەخۆيدا هەڵبات، ديارە ئەو كەسەی يەكەم لەپێناو رێبەرايەتی گەلو فەرمانڕەواكانداكاری دەكرد، ئەوەی دوهەميشی لەپێناو شاعيرەكاندا، سێ هەميش لەپێناو بێژەراندا، بەپێی، قسەی (ديوجين لايرس) هەموويان لەو چينانە بوون لەرەخنەكانی سوكرات بێزار بوون، دادگای (ئيلياست) كە سوكراتی تيادا بانگ كراو دادگايی كرا (٥٥٦) ئەندام بوون، كە بە دوو بەرە فەرمانی بەسەردا درا، يەكەم جار دوای مورافەعەی داواكاران، تاوانبار دەبوايە بيوتايە كە تاوانبارە يان بێ تاوانە، گەر دانی بەسزاكەيدا نرا، دەبوايە تاوانبار بە بۆچوونی خۆی ئەو سزايەی دياری بكردايە كە لەجێگەی خۆيدا بوو، دوای ئەوە دادوەران بەزۆربەی دەنگ چارەسەريان دياری دەكرد،

ئەو تۆمەتو قسانەی كە دژی سوكرات هەڵبەسترا لەلايەن دوژمنانيەوەو پێی تاوانبار كرا ئەم سێ حاڵەی خوارەوە بوون:-

١- بێ بڕوان بوون بە دينی دەوڵەت.

٢- هێنانە نانەوەی خواداوەندی نوێ بۆ يۆنان

٣- تێك دانی لاوەكان.

ئەوانە ئەو تۆمەتانەن كە سوكرات پێی تاوانبار كرا كە لەلايەن (ديوجين لاپرس) گێڕدراوەتەوە، ئەمەش دەقی ئەو تاوانەيە "ميليتوسی كوڕی ميليتوس لامبساك، سوكرات كە لە (ئەلوباس) لەدايك بووەو كوڕی سفرونيسك بەم تاوانانە تاوانبار دەكرێت: پيرۆزی ياساكان دەشێوێنێ واتە ئەو خوداوەندە رەت دەكاتەوە كە شار دانی پيادا ناوە، لەجێگای خوداوەندی شار خوداوەندی نوێ دادەنێ، لاوان تێك

دەدات، ناتوانین بیر لەو تاوانانە بكەینـەوە تـەنها بـەمردن نـەبێ"، چۆن سـوكرات وەڵامی ئەو تاوانانەی دایەوە؟ دەربـارەی ئـەو مەسـەلەیە دوو چیرۆك هـەن‌و هەنـدێ دەقی ئاراستە كراو، یەكێك لەو دوو چیرۆكە لای (دیو جین لایرس)ە وا پـێ دەچـێ كە (لیسیاس)ی گوتە بێژ ئەو بەرگریەی بۆ سـۆكرات خوێندبێتـەوە كـە لـەپێناوی ئەودا نوسیبێتی، (هاورێ كەم لەوانەیە فەیلەسوفەكە پێی وتبێ كـە دەقەكـە باشـە بەڵام بۆ من ناشێ لەڕاسـتیدا دارشـتنی دەقەكـە چـاكە بـۆ دادوەری وەك بشـێ بـۆ فەیلەسوفێكی رێك‌و پێك، لیسیاس كت‌و پڕ گوێی لەپیاهەڵـدان‌و بـەرگری كـردن بوو، سوكرات تكای لـێ كرد ئەوەی دەیلێ بـۆی شـی بكاتـەوە، (وەڵامــی دایـەوە، مـەحال نیە گەر جل‌و بەرگ‌و پێڵاوی چاك هەبێ‌و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ من نەشێ‌و بۆ خزمەتی من نەبێ)، مەسەلەی ئەو بەرگریەی دەخرێتـە پـاڵ سـوكرات، كسینوفون چــیرۆكێكی ترمــان لــەو بارەیــەوە بــۆ دەگێڕێتــەوە، هیرمــوجین ســوكراتی بــەوە ئاگاداركردەوە كە بەرگری بكات لەخۆی، (پێی وت، ئاگاداری ئەوە نین كـە چـەند لەبێ تاوانباران تووشی كێشە بوون لەبەردەم دادگاكانی ئەسینادا، بەڵام لەلایـەكی ترەوە زۆر لەتاوانباران بەرەڵاكران دوای ئەوەی داوای پاڕانەوەیان كرد لـە دادوەران‌و سیحری قسەكانیان‌و وتـەكانیان دادوەرانیـان بـێ هـۆش كـرد، سـوكرات وەڵامـی دایەوە، باشـە دووجـار ویسـتم ئـەم بەرگریـە بكـەم‌و جنۆكەكـەم دووجـار نەیهێشـت بـەرگری بكـەم، ـ ئـەوەی لێـرەدا دەیلێیـت جـێی سەرسـوڕمانمە، .. چـی! سـەرت سوڕدەمێنێ گەر خودا بەسوودەوە كۆتایی بە ژیانم بهێنێ، نازانیت كە من دەتـوانم بە بەڵگەوە تەحەدای ئەو كەسانە بكەم كـە خۆیـان بەچـاكتر دەزانـن لـەمن، منـیش زانیم كە ئەو بیرۆكەیە بەڵایە، من هەموو ژیانم ئیمانـداری‌و هاوڕێیـەتی بـووە؟ زۆر

بەهێز بووم بۆ سەرنج راکێشانی خەڵك بەلای خۆمدا، هەروەها ئەوەشم بینی کە قوتابییەکانم بە هەمان چاکە مامەڵەم لەگەڵ دەکەن، لەمەو دوا گەر پیشەکەم بەردەوام بێت ئەوا ناچار دەبم کە باجی بەساڵاچوویی بدەم؟ چاوم کز دەبێ‌و گوێم گران دەبێ‌و تێ گەیشتنم هێواش تر دەبوو، ئەوەی بە ئاسانی فێری دەبووم لەبیرم دەچووەوە، گەر ئەو پێچە تاقی بکەمەوەو لەخۆم بێزار بووم دوایی چی رام دەکێشێ بۆ ژیان؟ ئەم ریوایەتانە چەند بایەخیان هەبێ، ئەوا کەمتر ینیان دوو دەقی گرنگ‌و هاو شێوەی توندن کە دەبێ ئاگاداری بین، ئەو (بەرگری سوکرات)ەی کە ئەفلاتۆن بلاوی کر.ەوە بە دوای چەند رۆژی ژەهر خواردنەکەی سوکرات، ئەو بەگری‌یەی سوکرات کە کسینوفون باسی لێوە دەکات، لەبەشەکانی یەکەمی کتێبی (گفت‌وگۆ نەستەقەکان)دا هاتووە، ئایا ئەم دەقانە هۆدۆزی راستی‌و تەواویان تیادا بەدی دەکرێ کە سوکرات خستیە بەردەم دادوەران؟ لەوانەیە مەسەلەکە وابێ،

وا دەردەکەوێ ئەم دەقانە دوای مردنی سوکرات نوسراون بۆ پاساو کردنی یادکردنەوەی سوکرات. ئەوەشی تیا بەدی دەکرێ کە دەبوایە سوکرات بەدادوەری گەڵ لەوەزیاتر بلێ کەوتوویەتی، بەلام سەرەڕای ئەوەش هێشتا لەبەهاکەی کەم نابێتەوە، هەروەها ئەو گرێ بەستەی کە لەهەر دوو ریوایەتەکەدا هەن رووداوەکانیان بە ناوبانگە ئەوە دەگرنە خۆ کە ئەو رووداوانە لەواقیعدا روویان داوە، جیاوازی دەکەین لەنێوان ئەم دوو دەقەدا، پێش هەموو شتێ ئەوە تۆمار دەکەین: لەهەر دوو دەقەکەدا وا دەر دەکەوێ کە سوکرات خۆڕاگریەکی پتەوی هەبووە بەرامبەر ئەو کەرەستەو قسە قێوەزنانەی کە تاوانبارە ئاسایی‌یەکان دەتوانن بەهۆیانەوە بەزەیی دادوەران بۆ لای خۆیان راکێشن، کە زۆربەیان دەیانەوێ بە هەموو هێزێکیانەوە

رزگاریان بێت بۆ گەیشتن بەو كەنارەو ناگەڕێنەوە گەر كەرامەتیشیان لەسەر دانابێ، بۆ ئەوەش دەست دەكەن بەپارانەوە، پەیمان، وای دەبینن كە ژیان‌و پارێزگاری كردن لەژیان نرخێكی تر دەدەن بە كەرامەت، بە هەرحاڵ دڵنیا نین لەوەی كە مردن بە هایەك دابنێ بۆ ژیان،

بە هەرحاڵ ژیان هیچ شتێكی سەرنج راكێش پێشكەش بە پیاوێكی تەمەن حەفتا ساڵ ناكات، گەر تەمەنیش درێژ بێت ئەوا هیچ شتێك ناگەیەنێت تەنیا باروەزخێكە بۆ هەزاران ئازاری سروشتی‌و سكماكی.

ئەو جنۆكەیەی كە بەسروشت دێت بۆ سوكرات بەردەرگای دادوەری پێ نەگرت بۆ ئەوەی لەبەردەم دادوەردا ئامادە بێت، ئەو رەفتارەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئەو كارە كارێكی باش بووە بۆ سوكرات خۆی، بە چ شێوەیەك، كەواتە لەم رەوشەدا سوكرات لەمردن دەترسێ؟ ئەوەمان بینی كە لە (بوتیدە) لەمردن نەدەترسا، تەنانەت لە (ئەمنیبولیس)و (دالیوم) لەمردن نەدەترسا، ئەدی بۆچی دەبینین لەو تەمەنەدا لەمردن دەترسێ؟ كە وابێ پەنا بردن نەبێ بۆ هیچ زمان پاراویەكی بەئەنقەست كە بادانەوە بێ بۆ فرمێسكی چاو؟

هیچ كۆبونەوەیكی هاوڕێیانە بەدی ناكات بۆ ئەوەی بەرگری لێ بكرێ‌و ئەو بەرگریەش بسەپێنرێ، ژن‌و منداڵەكانی دیار نەبوون، هیچ پەیوەندی‌و هیچ پەیمانێك بۆ ئایندە بەدی ناكرێ لەحاڵەتی بێ تاوانیەكەیدا، سوكرات سوور دەبێ لەسەر ئەوەی گەر دادگا ئازادیەكەی بۆ نەگەڕێنێتەوە ئەوا ئەو ئازادییە تەنها لەو كارەدا بەكاری دەهێنێ كە هەمیشە هەوڵی بۆ داوە، بەم رەفتارەش دەكەوێتە ژێر هەستی ناوەوەی ئەو پەیامەی كە بۆی هاتووە لەلایەن خوداوەندەكان خۆیانەوە، ئەو

پەیامە ئەوەی پێیە کە گەلی ئەسینا خۆی نەدات بەدەست خەوتنەوەو سوور بوون لەسەر هێزو پتەوی بۆ کردەوەی باشتر لەهەموو رەوشێکداو بەو ژیرییەی لای گەل هەیە، هەروەها تازەکردنەوەی ویستی بالاّ بەرەو شکۆمەندی، سوکرات ناتوانێ واز لەو کێشانە بهێنێ ژیانی بەو شێوەیە بوو، بەدوای ئەو ئامانجەدا دەگەڕاو ئەمەش وای لێ کرد کە هەندێ شتی تایبەت و شتی دەوڵەت وەلا خات و بایەخی پێ نەدات، گەر ئازادی خۆی وەرگرێتەوە ئەوا بەهەمان کاری خۆی هەڵدەستێ بە هەموو چالاکییەوەو بەهەموو دڵێکەوە، بەلاّم ئەو سێ تاوانەی کە لەلایەن میلیتوس دارێژراو دژی سوکرات بەکارهێنرا هەمووی هەڵە بوو، میلیتوس سوکراتی بەوە تاوانبار کرد کەوازی لەخوداوەندی شار هێناوە، بەمە دەیەوێ چی بڵێ؟ ئایا سوکرات باوەڕی بە خوداوەندی تایبەتی ئەسینا نیە یان ئەوەتا ئەو باوەڕی بە هیچ خوداوەندێك نیە؟ کاتێك ئەو پرسیارە لەمیلیتوس کرایەکەو راست سوکراتی بەبێ ئیمان تاوانبار کرد. بەپێی قسەی میلیتوس، سوکرات بانگەشەی ئەوە دەکات کە خۆر تەنیا بەردەو مانگیش تەنیا ئەو زەوییەیە کە لەزەویەکەمان دەچێ. ئەمەش جێی مەترسییە سوکرات وەلاّم دەداتەوە: بە چ مافێك ئەو رایەی کە هی (لاناکسا گور)ەو بەهیچ شێوەیەك بەشداری لەو رایەیدا ناکات؟و دەیخەیتە پاڵ من. سوکرات لەهەموو کەسێك باشتر دەزانێ کە خوداوەند ئەم جیهانە دەگێڕێ. چۆن دەتوانین ئەو چاودێرییە دەرکەوتوەی شتەکان وەك چاو گوێ و پێ و دەستەکان باس بکەین؟ لەو هەموو ئەندامانە یەك بەڵگەمان دەست دەکەوێ ئەویش بوونی چاودێرێکە. میلیتوس بە زۆری زۆردار سوکرات تاوانبار دەکات، بۆچی وا دەکات؟ بەڵگە بۆ ئەو مافەی چییە کە من قینم لەخوداوەندی کۆمارە. هەموو خەڵك منیان

دیوه لەهەمموو چەژنەكاندا هاریكاریم كردووەو قوربانی دەدەم بۆ هەیكەلی گشتی؟ تاوانباری هێنانی خوداوەندی نوێ بۆ شار چی دەگەیەنێ؟ جیاوازیەكی سەیرو سەمەرو نامۆیەا ئەو دوو تاوانە سەرەكییەی كە میلیتوس پێشكەشی كردن لەنێویدا جیاوازیەكی تیادایە. چۆن بەبێ ئیمان تاوانبار دەكرێ و لەهەمان كاتیشدا بە ئیماندار بۆ خوداوەندی جیاوازی تر لەخوداوە ندی كۆمەلگا؟
لەكوێوە میلیتوس ئەم داهێنانە دەهێنێ؟ بە هۆی ئەوەی كە سوكرات جنۆكەیەكی هەیەو رێگری دەبێ لەهەندێ شتدا.
بەلام ئایا جنۆكە ئەو خوداوەندیە یان كوڕی خوداوەندە؟
باوەڕهێنان بەهۆی یان بەقسەكانی بە هیچ شێوەیەك بێ ئیمانی نیە. پێچەوانەكەشی راستە، بەچ شێوەیەك سوكرات شتی نوێ دەهێنێ؟ ئایا هێنانی خوداوەندی نوێیە، قسەكەش ئەوەیە كە دەنگی خودا لەگوێمدا دەزرینگێتەوەو كردەوەكانم ئاراستە دەكات؟ ئەوانەی داوای راوێژی دەنگی چۆلەكە دەكەن و لەقسە داوای رێكەوتن دەكەن، یان رەفتاری خۆیان بەپێی دەنگەكانی فۆنەتێكەوە رێك دەخەن؟ كێ نەهی لەوە دەكات كە هەورەتریشقە قسەدەكات و هەور بەهۆی دەنگەكانەوە زۆرترین هێز دەبەخشێ؟ ئایا بەهۆی ئەودەنگانەوە نیە كە (بیتی) لەسەر سەكۆ ئاگاداریەكانی خوداوەندەكان رادەگەیێنێ؟ بێ شك هەموو كەسێك بیردەكاتەوەو بڕیار دەدات وەك من كە خواوەند دەردەكەوێ و بڕیار لەسەر ئاین دەدات ئەوكاتەی كە دەیەوێ بەلام ئەوەشی پێشبینی ئاینده دەكات ئەوانی تر پێی دەلێن جریوەی چۆلەكەكان،

قسەیەكی ناكاوو سەیرو سەمەرە، بەكاهین كردنە؟ بەڵام مـن نـاوی دەنـێم جنۆكـە، لەبـەر ئـەوەی مـن ئـەوناوەی دەدەمـێ، مـن وای بـۆ دەچـم كـە زیـاتر لـەوانی تـر ئیماندارترم‌و زیاتر راستگۆترم لەوانەی كە توانای خوداوەند دەگەڕێننەوە بۆ باڵندە! لەبەر ئەوە نیە كە سوكرات لەهەندێ كاتدا سوێند بە (سەگ) دەخوات لەوانەیە وای بۆ بچین كە ئەو سەگ بەخوداوەند بزانـێ، بـەو شـێوە ئـەو دوو بەڵگەیـەی یەكـەمی میلیتـوس (پوچـەڵ)ن‌و بـێ بەڵگـەن. بـەڵام بەڵگـەی سـێ‌هەم (خـراپ كردنـی خورەوشتی لاوان) زۆر پڕو پوچەو مەبەستیان چی بووە لەوە؟ ویستیان بـەو قسـەیە بیسەلێنن كە سوكرات بەمەبەست ئەو كارەی كردووەو پێش ئەوە زانیوەیەتی كە بەو ئاراستەدا دەڕوات؟

بەڵام هەندێ نیەتی سەیرو سەمـەریان دەخستە پاڵی! چ سـوودێك دەبیـنین بـۆ سـەر هەڵدانی گەندەڵی ئاكار لەلای ئەو كەسانەی كە لەگەڵیاندا دەژین،

ئایا ویستیان ئەوە بڵێن كە سوكرات بێ مـەبەست ئاكار شێوێنە؟

لەم حاڵەتەدا تاوانبار نیە، لەبەر ئەوەی تـاوان لەكوێـدا دەبـێ گـەر لـەئیرادەوە سـەر هەڵنەدات؟ ئای لەو تاوانـە قەڵبـە مـەترسییە! ئایـا سـوكرات بـێ حیكمـەت‌و بـێ ئازایی‌و بێ دادپەروەری‌و بێ راستگۆیی دوا؟ پێتـان دەڵـێم كـە هونـەر سەرچـاوەی فەزیلەت نیە بەپێچەوانەوە فەزیلەت سەرچاوەی هونەرە لەوێوە هەموو چاكە گشتی‌و تایبەتیەكان‌و هی تر لەدایك دەبن، گەر بەم قسەیەم لاوان خراپ بكەم ئـەو كاتـە وا پێویست دەكات كە ئەو بڕیارە ژەهر بێت. یان گەروابڵێم كە من شتێكی تر دەڵێم خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن‌و بەمـەش پاڵتـان پێـوە دەنێـت بـۆ خـۆ فریـودان. سـوكرات نمونەیەك دەدات بەدەستەوە، هاوكاری دەكـات بـۆ بڵاوكردنـەوەی چـاكە كـاری نـەك

تەنيا بەقسەكانی بەڵكو بە هەموو كردەوەكانی ژيانی. كێ بوختـان بـۆ سـوكرات دروست دەكاتو وەك تێك دەرێك سەيری دەكات؟

ئايا ئەوانە بوون كە قوتابييەكانيان پێ نەگەياند؟

سوكرات هەندێ لەو ناوانە دەهێنێ كە لەوێدا ئامادەن، ئايا ئەوانـە قوتابييـەكانين؟ نەخێرو نـەخێر ئەوانـە هـەموويان هـاوڕێ دەسـت پاكـەكانی سـوكراتن كـە دان بـە شتەكانی سوكراتدا دەنێن. بەرهەڵستييەك هەيە كە ڕێی تێ ئەچێ ئەويش رەفتاری (كريتياس وأليبسياد)ە كە شەڕو ئاژاوەيان خستە نێو وڵاتەوە.

بـەڵام ئايـا يەكـەم مامۆسـتا بەرپرسـيارە لـەو هـەموو كردەوانـەی كـە قوتابييـانو فێركـراوان دەيكـەن. ئـەو دوو تاوانبـارەی سـەرەوە كـەناويان هـاتووە هـاتو چـۆی سوكراتيان دەكرد بۆ ئەوەی ژيانی لەگەڵدا ببەنە سەرو ئەو ژيانـە توانايـان دەداتـێ بۆ ئەوەی قسەی لێوە فێربنو كار بكەن، شێوەی ئەو ژيانەی كە سوكرات دەيخواست زۆر جياواز بوو لەچاوچنۆكيانو هەڵپەييان (بڕياريان دەويستو دەيان ويست قسە بوروژێنن دەربارەيان) فەزيلەت جێی بايەخی ئەوان نەبوو، نەخێر سـوكرات لاوانـی تێك نەدەدا، هەموو هەوڵێكی ئەوە بوو كە لاوان چاك بكـات، لەسـەر ئـەو هـەموو شتەوە بە تەواوی ميليتوس شارەزای ئەوە نيە كە چۆن دەبـێ لاوان هـەڵسو كـەوت بكەن بۆ ئەوەی چـاك بـن هـەروەها شـارەزا نيـەو نازانـێ ئـەو كەرەسـتانە چين بـۆ چاكسـازی، بـەڵام چـۆن تـوانرا سـوكرات لـەو سـاتەدا بـەو تاوانـە تاوانبـار بكـرێ؟ بەراستی گەر ژيانی هـەموو سـادەو سـاكار بوبـێ ئـەدی چـی وای كـرد كـە بـەرەو دادگای گەل پەل كێشێ كرێ؟

سوكرات دەتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، یەكەم كەس كە شاڵاوی بۆ برد (اریستوفان) بوو، بە وون بوون لەزانستی فەلەكیدا تاوانباری كرد، ناتوانین هیچ دەربارەی بزانین، كردیە سوفستائیەكو واخەڵكی فێر دەكرد كە ئەو ستەمەی دەكرێ دادپەروەریەو ئەو دادپەروەریەی كە دەكرێ ئەوا ستەمە، بەو شێوەیە سوكرات تێكەڵ بەفیزیازانەكانو سوفستائیەكان كرا بەڵام زۆر جیاواز بوو لێیان.

بەهۆشیاریو روونی دژی رێبازو بیروباوەڕیان رادەوەستا ئەو هۆكارە راستیانەی كە بوونە هۆی وروژاندنو دژایەتی كردنی سوكرات لەچەشنێكی تر بوون، شیریفون قوتابیو هاوورێی دڵسۆزی سوكرات بوو، چوو بۆ (دلف)و راوێژی بە فالچیەك كرد، لێی پرسی كە چ كەسێك حەكیمترە لەنێو خەڵكە زیندووەكاندا، وەڵامی دایەوە كە (بیتی) سوكرات حەكیمترینیانە (بیتی نازناوی سوكرات بووە) شیریفون ئەم قسەیەی بۆ سۆكرات گواستەوەو لێرەشەوە ئەركەكەی دەستی پێ كرد، لەراستیدا وا هەستی دەكرد كە زۆر نەزانەو كەمێك ژیرە، بەدوای قسەی فالچیەكە كەوت، پرسیاری لەمو لەو دەكرد، پرسیاری لەپیاوی سیاسەتو شاعیرو گوتە بێژی دەكر، هیوای ئەوە بوو كە كەسێك هەڵبژێرێ لەوانە كە لەخۆی ژیر ترو زیرەكتر بێت، ئەو هەڵبژاردنە ئەوەی پێدا گەر ئەو خۆی هیچ نازانێ ئەوا ئەوانی تر لەو زیاتر نازانن، بەڵكو بەیەك شت لەوان زیاتر ژیر تر دەبێو بەسەریاندا زاڵ دەبێ، ئەوان وا دەزانن كەشتێك دەزانن بەڵام ئەو بەكەمی ئەوە دەزانێ كە هیچ شتێ نازانێ، بە دواداچوونی ئەم پرسیارو لێكۆڵینەوانە دوژمنایەتی یەكی زۆری بۆ سۆكرات پەیدا كرد، ئەوانەی وایان دەزانی كە زۆر دەزانن ئەو راستی نەزانینیان دەخرایە بەر لێكۆڵینەوەی سوكرات، ئەو شێوازەی سوكراتیان بەدڵ نەبوو هەر بۆیە

تا مردن قینیان لەسوكرات دەبۆوە، (سوكرات) دەیگەیاندنە حاڵەتی گاڵتە جاڕی، لێرەوە پیلانە پیس‌و گلاوەكان تەون دەكران‌و دژی سوكرات دادەرێژران، مەترسی تریش ئەوە بوو كە سوكرات هیچ كاتێك ئامادە نەبووە كە كارێك تەواو نیە پێی هەستێت‌و بیكات، سوكرات ملی كەچ نەكرد بۆ فەرمانەكانی كریتیاس‌و شار كلیس لەسەردەمی سی كەسە ستەمكارەكە، ڕەزامەندی دەنگدانی فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەو حەوت جەنەڕاڵە نەدا كە لەدوای جەنگی (ئەرگینوز)ی دەریایی لاشەی كوژراوەكانی جەنگیان كۆنەكردەوە. ناڕەزایی دەردەبڕی‌و ژیانی خۆی قوربانی دەكردو پێشبڕكێی دەكرد بۆ قوربانی دانی ژیان بۆ ئەوكارە پۆلیسییە داهێنراوانەی سی كەسەكە كەهاولاتیانی ماندو دەكرد.

بەتوندی‌و بەڕاشكاوی ڕەخنەی لەهەندێ نەریتی ئەو دیماگۆجیەتە دەگرت كە لەئەسینادا هەبوو، كە بەپێی دەنگدان دەخرانە سەركاری وەزیفی سەرەكی،

(ئەمە دەبەنگییە سوكرات وای دەگوت كە دەنكە پاقلەیەك بڕیاری هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمار دەدات، بەلام دەنگدان لەپێناو كە پیتانی پاپۆڕێكدا یان ئەندازیارێكدا یان یاری زانی یانەیەكدا یان هونەرمەندان ناكرێ كە زیانی هەڵەكانیان زۆر كەمترە لەهەڵەی فەرمانڕەواكان).

ئەمانە هەموو تەمێكی خەستیان دروست كردو گەردەلولێكیان ئامادەكرد كە بووە هۆی لەدەست دانی ژیانی سوكرات ئەو قوربانیە بێ تاوانە، ئەمە ئەو دوو هێڵە هاوبەشەیە لەنێوان ئەو دوو بەرگریەدا كە دەستمان كەوتووە دەربارەی سوكرات، گەر دادگایی كردن گوێزانەوەیەكی حەرفی نەبێ ئەوا بە كەمی ئەو بیركردنەوەیە هەڵدەگرێ كە دەبوایە ببوایە، ئەنجامەكەی زۆر جوان بوو دەبوایە دادگا

سوكرات دەتوانێ وەلامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، یەکەم کەس کە شالاوی بۆ برد (اریستوفان) بوو، بە وون بوون لەزانستی فەلەکیدا تاوانباری کرد، ناتوانین هیچ دەربارەی بزانین، کردیە سوفستائیەكو واخەڵکی فێر دەکرد کە ئەو ستەمەی دەکرێ دادپەروەریەو ئەو دادپەروەریەی کە دەکرێ ئەوا ستەمە، بەو شێوەیە سوکرات تێکەڵ بەفیزیازانەکانو سوفستائیەکان کرا بەڵام زۆر جیاواز بوو لێیان.

بەهۆشیاریو روونی دژی رێبازو بیروباوەڕیان رادەوەستا ئەو هۆکارە راستیانەی کە بوونە هۆی وروژاندنو دژایەتی کردنی سوکرات لەچەشنێکی تر بوون، شیریفون قوتابیو هاورێی دڵسۆزی سوکرات بوو، چوو بۆ (دلف)و راوێژی بە فاڵچیەك کرد، لێی پرسی کە چ کەسێك حەکیمترە لەنێو خەڵکە زیندووەکاندا، وەلامی دایەوە کە (بیتی) سوکرات حەکیمترینیانە (بیتی نازناوی سوکرات بووە) شیریفون ئەم قسەیەی بۆ سۆکرات گواستەوەو لێرەشەوە ئەرکەکەی دەستی پێ کرد، لەراستیدا وا هەستی دەکرد کە زۆر نەزانەو کەمێك ژیرە، بەدوای قسەی فاڵچیەکە کەوت، پرسیاری لەمو لەو دەکرد، پرسیاری لەپیاوی سیاسەتو شاعیرو گوتە بێژی دەکر، هیوای ئەوە بوو کە کەسێك هەڵبژێرێ لەوانە کە لەخۆی ژیر ترو زیرەکتر بێت، ئەو هەڵبژاردنە ئەوەی پێدا گەر ئەو خۆی هیچ نازانێ ئەوا ئەوانی تر لەو زیاتر نازانن، بەڵکو بەیەك شت لەوان زیاتر ژیر تر دەبێو بەسەریاندا زاڵ دەبێ، ئەوان وا دەزانن کەشتێك دەزانن بەڵام ئەو بەکەمی ئەوە دەزانێ کە هیچ شتێ نازانێ، بە دواداچوونی ئەم پرسیارو لێکۆڵینەوانە دوژمنایەتیەکی زۆری بۆ سۆکرات پەیدا کرد، ئەوانەی وایان دەزانی کە زۆر دەزانن ئەو راستی نەزانینیان دەخرایە بەر لێکۆڵینەوەی سوکرات، ئەو شێوازەی سوکراتیان بەدڵ نەبوو هەر بۆیە

تا مردن قینیان لەسوكرات دەبۆوە، (سوكرات) دەیگەیاندنە حاڵەتی گاڵتـە جاڕی، لێرەوە پیلانە پیس‌و گڵاوەكان تەون دەكران‌و دژی سـوكرات دادەرێـژران، مەترسـی تریش ئەوە بوو كە سوكرات هیچ كاتێك ئامادە نەبووە كە كارێك تـەواو نیـە پـیّ‌ی هەستێت‌و بیكات، سوكرات ملی كـەچ نـەكرد بـۆ فەرمانـەكانی كریتیـاس‌و شـار كلیس لەسەردەمی سی كەسە ستەمكارەكە، ڕەزامەندی دەنگدانی فەرمانڕەوایـەتی بۆ ئەو حەوت جەنەڕاڵـە نـەدا كـە لـەدوای جـەنگی (ئـەرگینوز)ی دەریـایی لاشـەی كوژراوەكـانی جـەنگیان كۆنـەكردەوە. نـاڕەزایی دەردەبـڕی‌و ژیـانی خـۆی قوربـانی دەكـردو پێشـبڕكێ‌ی دەكـرد بـۆ قوربـانی دانـی ژیـان بـۆ ئـەوكارە پۆلیسـییە داهێنراوانەی سی كەسەكە كەهاوڵاتیانی ماندو دەكرد.

بەتونـدی‌و بەڕاشـكاوی ڕەخنـەی لەهەنـدێ نـەریتی ئـەو دیماگۆجیەتـە دەگـرت كـە لەئەسینادا هەبوو، كە بەپێی دەنگدان دەخرانە سەركاری وەزیفی سەرەكی،

(ئەمە دەبەنگییە سوكرات وای دەگوت كـە دەنكـە پاقلەیـەك بڕیـاری هەڵبـژاردنی سـەرۆك كۆمـار دەدات، بـەڵام دەنگـدان لـەپێناو كـە پیتـانی پاپۆڕێكـدا یـان ئەندازیارێكـدا یـان یـاری زانـی یانەیەكـدا یـان هونەرمەنـدان نـاكرێ كـە زیـانی هەڵەكانیان زۆر كەمترە لەهەڵەی فەرمانڕەواكان).

ئەمانە هەموو تەمێكی خەستیان دروسـت كـردو گـەردەلولێكیان ئامـادەكرد كـە بووە هۆی لەدەست دانی ژیانی سوكرات ئـەو قوربانیـە بـێ تاوانـە، ئەمـە ئـەو دوو هێڵـە هاوبەشـەیە لـەنێوان ئـەو دوو بەرگریـەدا كـە دەسـتمان كـەوتووە دەربـارەی سوكرات، گەر دادگایی كـردن گوێزانەوەیـەكی حـەرفی نـەبێ ئـەوا بـە كـەمی ئـەو بیركردنەوەیە هەڵدەگرێ كە دەبوایە ببوایە، ئەنجامەكەی زۆر جوان بوو دەبوایە دادگا

ئەوەی یەکلا بکردایەتەوە ئایا سوکرات تاوانبارە یان بێ تاوان (٢٨١) کەس دەنگیان دژی سوکرات داو (٢٧٥) کەس لەگەڵ سوکرات بوون.

بچوکترین گۆڕان ژیانی لەمردن رزگار دەکرد،

لەو ساتەدا گفتوگۆی سەغڵەت دەست پێ دەکات، دوای راگەیاندنی بڕیاری دادگا لەسەر تاوانبار پێویست بو هەر وەك لەپێشدا باسمان کرد وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوەکە بونەتە هۆی سزادانی، بۆ ئەوەی خۆی هەمان سزا هەڵبژێرێ، سوکرات بەشێوەیەکی ساکارانە رای خۆی لەبابەتەکەدا دەربڕی بە شێوەیەکی گاڵتەپێ کردن، نایەوێ دوور بخرێتەوە، ناتوانێ سزای (مینە) یەك دابین بکات، راستە هاوڕێکانی ویستیان لەبری ئەو سزاکە بدەن، بەڵام سوکرات رەتی کردەوە، هەرکاتێك بیری لێ دەکردەوە ئەمە دەهات بە بیریدا، کە ئەو واز لەکاری چاکە ناهێنێ بۆ نیشتمانەکەی، کەواتە تەنیا یەك سزا هەیە کە بۆ ئەو دەشێ ئەویش نان خواردن بوو تا مردن لە (بریتانی)و لەسەر حسابی دەوڵەت، ئەنجامگیری ئەو رووبەڕووبونە گاڵتە جاڕیە خێرایی‌یە بوو دوای ئەوەی سوکرات بەکۆی دەنگی زۆرینە تاوانبار کراو بڕیاری مردنی بەسەردا درا، سوکرات بۆ ئەو بڕیارە دانەچڵەکی، پێشبینی دابە ئەسینیەکان کە بەم کردەوەیەیان لەکۆتاییدا ئەسەف زۆر دەخۆن.

هەروەها بۆ ئەو هەڵوێستەی وەریان گرتووە لەدژی ئەو تاڵی دەچێژن، سوکرات مەسەلەکە وا دەردەخات کە مردن خراپە نیەو ئەویش پیاوێکی پیرەو بەساڵا چووە لەوانەیە گەورەترین چاکە کار بێت،

تاوان بەسەریدا جێبەجێ کراو سەپێنرا، سوکراتیان بەرەو بەندیخانە راپێچ کرد. لەژێر چاودێری یانزە کەسدا بوو، پێویست وا بوو کە سنوورێك بۆ رۆژەکانی

دابنیٚ‌و ژەهر بخواتەوە لەبەر هەر هۆیەکی فریاگوزاریانە جیٚبەجیٚ کردنی بڕیاری گەل رادەوەستا، هەموو ساڵێك ئەسینیەکان کەشتییەك بەرەو (دیلوس) دەبەن، لەسەرەتای (فیدون)دا (ئەشیکرات) پرسیار دەکات، (ئەم کەشتییە چییە؟) فیدون وەڵام دەداتەوە (بە پیٚی قسەی ئەسینیەکان ئەو کەشتییە کە لەپێشوتردا (تیزی) ئەو حەوت کوڕو حەوت کچەی کە رزگاری کرد بوو لە (مینوتور) لەکاتی قوتارکردنی خۆیدا) هەمان ئەو کەشتییە یە کە تیزی بەرەو (کریت)ی برد. دەگێڕنەوە لەکاتی رۆشتنیاندا ئەسینیەکان قوربانیان دا بە (ئەبو لون) کە تیزی‌و هاوڕێکانی رزگاریان بێت لەمردن، بەو بۆنەیەوە هەموو ساڵێك گەشتێکی ڤیستیڤاڵی بۆ دیلوس دەکریٚ؟ هەر لەو کاتەوە ئەو قوربانیە دەکەن‌و کردویانەتە پیشە، بەپیٚی ئەو بۆنەیە دەستورێك هەیەو بووە بە یاسا لەئەسینادا ئەویش ئەوەیە کە دەبیٚ شار پاك بێت‌و هیچ بڕیارێکی مردنی تیادا جیٚبەجیٚ نەکریٚ لەو کاتەدا واتە پێش ئەوەی کەشتییەکە بگاتە دیلوس‌و بگەڕێتەوە بۆ ئەسینا. هەندیٚ جار کە بای دەریا پێچەوانە دەبێت ئەوا ئەو گەشتە زۆر دەخایەنیٚ بەهۆی باکەوە. ڤیستیڤاڵەکە دەست پیٚ دەکات‌و کاهینی ئەبولون لەپێشەوەی کەشتییەکە دەبینریٚ.

ئەم ئاهەنگە ئەو شەوە دەست پێکرا کە (شەوێك پێش بڕیاردانی مردن بەسەر سوکراتدا بوو) بەو شێوەیە ژیانی سوکرات سی رۆژی تر درێژەی کێشا لەو ماوەیەدا واتە لەماوەی ئەو سی رۆژەدا سوکرات داستانەکانی (ئیزوب)ی خستە نێو قاڵبێکی شیعرییەوە. هەروەها هاوڕێکانی هەوڵیان دا یا پوختی بکەنەوە یان کورتی کەنەوە. ئەمە بووە سەرچاوەی ئەو گفت‌وگۆ گەرم‌و گوڕەی کە ئەفلاتۆن ناوی

نا (کریتون)، کریتون هاورێیەکی دێرینی سوکرات بوو، هاورێیەکی دەوڵەمەندو بەگڕو تین بوو، هەموو ئەگەرێکی مەیسەرو چارەسەر دەکرد، گەر سوکرات بیویستایە رابکات ئەوا کریتون دەیتوانی بۆی جێبەجێ بکات، هەر لەیەکەم سەعاتی گیرانی (سوکرات)ەوە لەبەندیخانە ئامادە بوو، کەشتییەکەی (دیلوس) ئەوەندەی نەما بوو بگەڕێتەوە (بیریە)، بواری کات بەفیڕۆدان نەما بوو، سیمیاس (تیبی) پارەی پێویستی هێنا، سێبیس‌و زۆری تر هەمان شتیان دەهێناو پێشکەشیان دەکرد، گەر سوکرات بیەوێ بڕوات بۆ (تیسالیا) لەوێ بەشێوەیەکی زۆر جوان پێشوازی لەمیوانەکەیان (سوکرات) دەکەن، بابیر لەهاورێکانی بکاتەوە، بیر لەمنداڵەکانی بکاتەوە کە پێویستیان بەوە، شەوی داهاتوو دەبێ هەموو شتێ کۆتایی پێ‌بێ‌و جێبەجێ کرێ، گەر دوابکەوین ئەوا کارەکە فەشەل دەهێنێ‌و ریسەکە دەبێتەوە بەخوری، بەڵام سوکرات راناکات، ئەمە ئەو هۆکارانەن کە ئەفلاتۆن دەیکات بەهانەیەك بۆ بڕیارەکانی، سوکرات هەمیشە بە پێی بنەماکانی دادوەری رەفتاری کردووە، ئەو پرسیارەشی لەخۆی دەکرد ئەمەیە (ئایا دەتوانم عەقڵ بشارمەوەو خۆمی لێ لادەم) ئەوەی پێشنیارمی دەکەن کە راکەم‌و خۆم رزگار کەم؟ ناتوانم ئەو بیروباوەڕانەی کە لەهەموو ژیانمدا رام گەیاند وازی لێ بهێنم بەهۆی ئەو نەگبەتی‌یەی دابەزیوەتە سەر سەرم، من هەمیشە بەو چاوەوە سەیری زانیاریەکانم دەکەم؟ کە (هەمیشە بە تواناو بەروونی وەك پێشوتر دەردەکەون، گەر لەوە باشترت پێ نیە بۆ ئەوەی لەبری ئەوەی داینێی... باش دەزانم کە ناتوانیت لەخۆراگریم کەم کەیتەوە)، کەوا بێ ئەوەی پێویستە بە دوایدا بگەڕێین ئەوەیە کە پارە دراوەتە ئەو کەسانەی کە لێرە رزگارم دەکەن، لێرەوە ئەو ئەرکانەی

کـه بەرامبـەریان دەبوایـە بمکردایـە سـەپاندم بەسـەر خۆمـدا، کەواتـە ئایـا ئـەم ڕەفتارەمـان لەگەڵ دادوەریدا یەکی دەگرتـەوە، یـان هـەموومـان، مـنو ئـەوان، دژی دادوەری ڕەفتـار دەکـەین، لـەم حاڵەتـەدا پێویسـتە لێـرە بمێنێتـەوەو هـەموو شتێ تەحەمول کەم تا مردن بەم شێوەیە ئەو پرسیارەی کرا وەڵامێکی تـەواوی وەرگـرت، ئەمـەش ئەوەیە کە یاسا بەناوبانگەکان ڕوونیان دەکاتەوە (لەکاتی ڕاکردنماندا، هەر وەك چۆن خۆت پێت خۆشە بلێی لەکاتی دەرچـونماندا گـەر ڕووبـەڕووی یاسـاکانو کۆمـار ببینەوەو پرسیاری لـێ کردین، ئەوە چ دەکەیت سوکرات؟).

ئەمـە هەڵوێستێکی تاوانبارە لەبـەر ئـەوەی دەبـێ یاسـاکان چـی بڵـێن؟ ئایـا ئێمـە لەسەر ئەوە پەیمانمان بەستووە یـان ئـەوەتا ئـەو کـارەی کـە ئامادەمـان کـردووە بـۆ خۆتو بۆ خۆمـانو دەوڵەتیش بە هەموو دامو دەزگاکەیەوە هەڵبگەڕێنینەوە؟ لەبـەر ئەوەی چ دەوڵەتێك دەتوانێ بەردەوامی بە خۆی بدات گەر بڕیـارە ئاشـکراکانی بـێ هێزبنو خەڵکان پێی لـێ بنێن، ئەی کریتون چ وەڵامێك لـەم ئاگادارکردنەوەیـەدا دەدۆزرێتەوە لەوانەیە وەڵامێکی وابێت بەبیرمـاندا گەر بـەم شـێوەیە ڕەفتـار بکـەین (کۆمـار ستەمی لـێ کردینو بڕیـاری دادپەروەرانـەی نـەدا) لەسـەر ئـەوە پـەیمانمان بەست کەملکەچی ئەو بڕیارە بین کە کۆمـار بەسەر تا دەیسەپێنێ، واتـە گـەر خـۆت ئامـادە کردبێت بۆ دژایەتی کردنی ئەوا خۆی لەخۆیدا ڕوخاندنیەتی، بە هەرحاڵ تۆ بە ژیانی خۆت قەرزار باری ئەویت لەبەر ئـەوەی ئاگـاداری زەماوەنـدی خزمـەکانت بویت، ئەو پەروەردەیەی فێر کراویت وای کرد کە یاساکان جێبەجێ بن، بەلای تۆوە ئەوە وەك باوکایەتی وایەو وەك باوکێکی تایبەت وایە، پێویستە ڕێـزت هـەبێ بـۆی هەر وەك چۆن ڕێـزت هەیـە بـۆ بـاوکی خـۆت، پێویسـتە ڕێـز لەنیشـتمان بگریـت

لەكاتی تورە بونیداو پێویستە مل کەچی بیتو بایەخی پێ بدەیت زیاتر لەو رێزو خۆراگریەی کە هەتە بۆ باوکت، هەوڵ دەدەیت کە نیشتمان بگەڕێنیتەوە رێگەی راست، بە باوەڕ پێ‌کردنی یان بەمل کەچ بوون بۆ فەرمانەکانی... لەمەیدانی جەنگداو لەبەردەم دادوەرانداو لەهەموو شوێنێك بێ پێویستە ئەوەی کە کۆمار داوات لێ دەکات جێ‌بەجێ‌ی کەیت یان ئەو کەرەستانە بەکار بهێنیت کە یاساکان رێ‌ی پێ دەدەن، گەر ئەوەی گوترا راست بێت، کەواتە دەرئەنجامەکەی حەتمی‌یە لەبەر ئەوەی کۆمار بڕیاری بەسەردا دایت، لەبەر ئەوەی ئێمە نەمانتوانی قەناعەتی پێ بکەین بەوەی کە کردویەتی ستەمە، هیچ شتێکمان بۆنەماوەتەوە بۆ ئەوەی دادپەروەر بین تەنها ئەوە نەبێت کەمل کەچی بین‌و تەحەمولی ئەو بڕیارە بکەین کە بە سەرماندا دەیسەپێنێ ئەوا بەراستی یاساکان ئەمەمان پێ دەڵێن، کە ئەم رەفتارە رەفتاری (کۆیلەیەکی سوکە) ئەمە راکردنە (بەپێ‌ی ئەو هاوپەیمانی‌و ئەرکە پیرۆزەی کە دەبنە هۆی مل کەچ پێ کردنت بۆ ئیمپراتۆریەتەکەمان)، ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە: ئایا بەراستی سوکرات وای دەبینی گەر هەڵبێت لەبەندیخانە ئەوا خێرێکی حەقیقی بەدەست دەهێنێ‌و بۆ ئەوانی تر سوودێکی تەواوی دەبێ؟ "ئەوە روونە کە هاورێکانت رووبەڕووی مەترسی کۆچ پێ کردن دەبن یان لەدەست دانی مافی هاوڵاتییان لێ دەسەندرێتەوە یان نەمانی سامانیان، بەڵام گەر بۆ خۆت چوویتە شارێکی دراوسێ (تیب) یان (میجار) خەڵکانی ئەو دوو شارە خاوەن پەروەردەیەکی باڵان، بۆیە وەك دوژمنێك سەیر دەکرێیتو بەچاوێکی دوژمنەوە سەیرت دەکەن،

هەموو هاولاتییەك بەچاوێكی ترەوە سەیرت دەكەن بەوەی كە دەبیتە هۆی بۆگەن كردنی یاساكان. ئایا خۆت لەو شارە رێكخراوو كۆمەلگا خاوەن پیاو چاكانە لادەدەیت؟

گەروا بێ ئایا ژیان لەوێ پێویستە؟ سوكرات گەر لەگەلیاندا ژیان بەریتە سەرو لەگەلیاندا بژیت چییان پێ دەلێیت؟

ئایا هەمدیسان دەست دەدەیتە ئەوەی پێشوتر كە دەتوت، بەوەی كەناشێ شتێك بخرێتە سەرو مرۆڤ و سەرو فەزیلەتو دادپەروەری یاساكانو بڕیارەكان؟ دوای ئەوە لەو تەمەنەی تۆدا كە دیارە بە شێوەیەكی زۆر توند ژیانت خۆشو ویستووە دوای ئەوەش دەرت خست كە هیچ بایەخی پێ نادەیت؟

مندالەكانیشت لێت جودا دەبنەوە، چ سوودێك لەدرێژەی تەمەنت دەبینن؟.... دوای ئامۆژگاریەكانی ئەوە بكەوە كە بەخێوت دەكات، مندالەكانو ژیانت لەدەست مەدە هیچ شتێكی تر كە لەسەرو دادپەروەریەوە بێت لەدەستی مەدە، گەر لەوپەیمانە لات دا كە تۆی بۆ ئێمە مل كەچ دەكرد ئەوا ئەو كەسانەی كە پێویست دەبوو بیانپارێزیت دەیانخەیتە بەردەم مەترسی، خۆت، هاورێكانت، نیشتمانەكەت، هەروەها ئێمەش دەخەیتە بەردەم مەترسی، بەراستی دیمەنێكی كورت كراوەی بەناوبانگ بوو كە سوكرات رازی كرد بەوەی مردن بەچاكتر بزانێ وەك لەوەی شەرمەزار بێت لەبەردەم ویژدانیدا دوای دیمەنی تراژیدیەكەی تەواو كرد،

فیدون دوا چركە ساتی ئەو رووداوەمان بۆ دەگێرێتەوە، كاتی ئەوە هات كە سوكرات پەرداخە ژەهرەكە بخواتەوە، بەپێی نەریت كۆتو زنجیرەكەی لێ دەكەنەوە، ری درا بەكەسو كارو هاورێكانی كە ئامادەبن بۆ دوا مال ئاوایی كردن لەسوكرات، تا

خۆر ئاوانه بوو سوكرات ژەهرەكەی نەخواردەوە، ئامادەبوان هەڵبژاردەو زۆر بوون، لەنێو ئامادەبواندا ئەمانە بوون، فیدون، سیبیس، أبو للودور، سیمیا، كریتون، هەندێ جار كسانیتب ژنەكەی سوكرات ئامادە دەبوو، بەڵام ئەفلاتۆن كە لە (میگار) پەناهەندە بوو ئامادە نەبوو، (ئەشیكرات) تكا لەفیدون دەكات كە ئەوەی رووی داوە بۆی بگێڕێـتەوە، لەكاتی كردنەوەی كۆتو زنجیری دەستی سوكراتدا، سوكرات وەك فەیلەسوفێك رەفتاری كرد، قاچی بە ئازاراوی خوراند، جارێكی تر تاقی كردەوە كە چاودێری كردن هاوسەری بەزەبری چێژو ئازار كرد.
هیچ كامێكیان راناوەستێ تا ئەو كاتەی ئەوی تر دەرنەكەوێ، راوەستان لەئازار بەختیاری‌یە، ئەو ئازارە راوەستانە لەخۆشگوزەرانی بە روونی قاچەكانی سوكرات ئەو حەقیقەتە دەردەخەن، گفتوگۆ دەكرێتەوە لەكاتی خۆرئاوا بوندا سوكرات بەرەو مردن رێ دەكات، كەوا بێ دەربارەی ئەو چارەنوسەی كە چاوەروانیەتی زیاتر لەچی تر دەدوێ، ئایا مردن كۆتایی هەموو شتێكە، ژیان، دەروون، یادەوەریەكان؟ ئایا پێچەوانەی پەرینەوەیە بۆ بونێكی تر كە دەروون تیایدا دەژی ئازادە كە كۆتەكانی بەدەن لەشوێنە نەبینراوەكان؟، سوكرات بەراست دەزانێ هەر بۆیە سوكرات گفتوگۆیەكی چڕی لەسەر دەكات، شك لەوەناكەین كە ئەو بەڵگانەی ئەفلاتۆن لەسەر زاری سوكرات هێناویەتی لەدانانی خۆی بووە، یان دەستی باڵای هەبووە لەوەدا؟

ئایا سوكرات رای وا بووە كە دژ لەدژەكەیەوە دێ، بەشێوەیەكی تر مردن لەژیانەوە دێت، پێویست دەكات كە ژیان لەرێی مردنەوە خۆی بێت. سوكرات وای دەبینێ كە دژ ناتوانێ دژ لەخۆیدا قبوڵ بكات، بە شێوەیەك كە دەروون بنەمای ژیان بێت،

ناتوانێ مردن لەخۆیدا قبوڵ بكات كە دژیەتی، ئایا ئەو بوو تیۆری یادەوەری ڕاگەیاند كەوا لەزانست دەكات تەنیا یادێك بێتو هیچی تر، دەروون پێش لەدایك بوون هەبووە، دوای مردنیش بەردەوام دەبێ، بە هەرحاڵ سەرەڕای هەڵوێستی سیبیس، دەروون بۆ بەدەن نیە هەر وەك چۆن گۆرانی بۆ كەمان! ئایا ئەو وای دەبینێ كە سروشتی سادەی دەروون پێچەوانەی سروشتی بەدەنی تێكەڵە، دەرەنجامی ئەوەی گەر بەدەن بۆ گەن بكات ئەوا لەبەر ئەوەیە كە قابیلی هەڵوەشانە، دەروون بۆگەن نابێ لەبەر ئەوەی سادەیەو هەڵناوەشێ، ڕووی میتافیزیكی لەو هەموو قسانە بەشێوەیەكی بەهێزو ڕوون دەردەكەوێ. زەحمەتە بتوانین ئەو قسانە بخەینە پاڵ سوكرات، لەبەرامبەر ئەوەدا لەوانەیە بۆ ئەوە بچین كە مردنی بەدەن بەند نییە بە مردنی دەروونەوە، باوەڕهێنان بە بەردەوامی دەروون نەریتێكی كۆن بووەو بە بەڵگەی پتەو نەبێ ڕاناوەستێ، بێ گومان ئەو ڕایگەیاند كە سەركێشییەكی جوانە، سەركێشی كردن لەبڕواو بەردەوام بوونی دەروون بە پێی ئەو چوارچێوەیە سەر كێشییەكی جوانە، كەوا بێ بۆچی خۆمانی لێ بێ بەش بكەین؟ بۆچی بێ بەری بین لەبیركردنەوە كە دەبینین دوای ژیان لەم جیهانەدا چاكە كاران پاداشت دەكرێنو شەڕخوازەكان سزا دەدرێن؟

ئایا ئەم بیروباوەڕە یارمەتی خەڵكان نادەن كە ژیانو مردن بەدڵنایی بەرنە سەر؟ بەو شێوەیە ئەگەری ئەو هەڵەیە دابنێین، ئەو كەسەی بەهەڵەكانی دەمرێ نادۆزرێتەوە. بەڵام مردن سڕینەوەی هەموو هوشیاریەكە، دوایی مردن هیچ نیە، یان ئەوەتا هوشیاری بەردەوام دەبێت دوای مردن، دوای ئەوە ویژدانی دەگاتە ئاسوو دە، دیارە سوكرات ئەو بیرۆكانەی وەرگرتووەو بەڕوونی گوزارشتی لێ كردووە، تا

خۆرئاوا بوون گفتوگۆ بەردەوام دەبێ کاتی ئەندێشەو ئازارە، هەروەها کاتی ئازایەتیو پاکژییە، ئەفلاتۆن ئەو گفتو گۆیەی بەشێوەیەکی سادەو سەرنج ڕاکێش نمایش کردووە بەجۆرێك تاوانە گەر لەو گێڕانەوەیە فۆنەتیکێك بگۆڕین، سەرەڕای ئەوە دەقەکە درێژە لێرەدا وای بەباش دەزانین کە گوڵ بژێری کەین، وەك چیرۆکێك وایە کە دەتوانین پێی بڵێین ئازارەکانی سوکرات، سوورین لەسەر ئەو قسەیەی دەیلێین کە ئەم ڕووداوانە بە ووردی شایستە نین بۆ پیاوێکی ژیر، بەڵام هەر چیەك دەربارەی دەروونو شوێنی نیشتەجێی دەروون بوم باس کردن لەواقیعدا بەشێوەیەك باسم کردووە کەوێك چێ، شتێکی تەواویشە کە دەروون نامرێ، دەبێ ئەم رایە بە هەند وەرگرینو کێشەکە بە باوەڕپێهێنانی سەرچڵیەوە سگماکە.

ئەمە سەر چڵییەو باشتروایە پێی هەستین، تکایە وا پێویستە کە خۆمان بدەین بەدەست سیحرەکەیەوە، ئەمە ئەو هۆیەیە کە ماوەیەکی درێژە وای لێ کردم بەردەوام بم لەم گفتوگۆکردنەدا، با ئەو بەدرێژی ژیان باوەڕ بکات کە دڵ مردوو بوو بەرامبەر بە چێژو خۆشییەکانی بەدەن هەر وەك چۆن نامۆ بوو هەروەها مەیلی بەلای شەڕدا دەچوو، خۆشترین چێژی زانست بوو بەلایەوە، بەجوانیەکی قەڵب خۆی پیشان نەدەدا بەڵکو بەو جوانیەی کە لەتایبەتمەندیەکانی دەروونە وەك، میانڕەوی دادپەروەری هێزو ئازادیو حەقیقەت،

پێویستە لەسەری زۆربە هێمنانە چاوەڕوانی ئەوە بکات کە بۆ جیهانێکی تر دەچێت، وەك ئەوەی لەئامادەبوندا بێت کاتێك قەدەر داوای دەکات بۆ گەیشتن، بەڵام سیمیاسو سیبیس هەر یەکێك لەئێوە ئەو گەشتە دەکات لەکاتی خۆیدا، بەڵام من ئەمڕۆ قەدەر بانگم دەکات، هەر وەك چۆن شاعیرێکی تراژیدی دەڵێ،

كاتی ئەوە هاتووە بچین بۆ گەرماو، وا باشترە ژەهرەكە دوای خۆشوشتن بخۆمەوە، بەمەش زەحمەتی شوشتنی لاشەیەك لەسەر ژنان كەم دەكەمەوە، دوای ئەوەی سوكرات گفتو گۆكەی تەواو كرد كریتون كەوتە گفتوگۆ لەگەڵ سوكراتدا، سوكرات ناوی خوای لێ بنێ، بەڵام ئایا هیچ وەسیەتیەكت هەیە بۆ منو بۆ ئەوانی تر،

چ لایەنی منداڵەكانتەوە بێت یان لەلایەنی شتێكی تر تا بتوانین خزمەتێكت پێ بگەیە نین؟ ئەی كریتون وەسیەتتان بۆ دەكەم هەر وەك پێشوتر وەسیەتم بۆ كردوون، هیچ شتێكی تر نا، ئاگاداری خۆت بە؟ لەوەدا خزمەت بە منو خێزانەكەم دەكەیت خزمەتی خۆشت دەكەیت، گەر ئێستاش پەیمانی هیچ شتێكیشم نەدەیتێ، بەڵام گەر خۆت كەمتەرخەم كردو ئەوەت جێبەجێ نەكرد كە پێش تۆزێ لەسەری دوایـن‌و ئەوەشی لەدێر زەمانەوە دەمان ووت، پەیمان هیچ سوودێكی نابێ كەواتە هیچ خزمەتێك ناگەیەنێ، كریتۆن بەم شێوەیە وەڵامی سوكراتی دایەوە، هەموو هێزێك دەخەینە گەڕ بۆ سەرگرتنی ئامۆژگاریەكانت، بەڵام چۆن بەخاكت بسپێرین؟ سوكرات وەڵامی دایەوە، چۆن ئارەزوو دەخوازن، گەر توانیتان بمبەن، دوایی لەهەمان كاتدا بەزەردەخەنەیەكی نەرم‌و نیانەوە وتی، ئەی هاوڕێیان، نازانم چۆن سەركەوتو دەبم بەرازی كردنی كریتون بەوەی كەمن هەمان ئەو سوكراتەم كە پەشیمانە لەگەڵتاناو هەموو بەشەكانی گوتارەكانی ڕێك دەخاتەوە! هەمیشە وا دێتە بەرچاوی من ئەو كەسەم كە دوای كەمێكی تر بە مردویی دەمبینی هەروەها پرسیاری ئەوەم لێ دەكات كە چۆن بەخاكم بسپێرێ؟ ئەم هەموو گوتارە درێژەی كە ئێستا بۆم گێڕانەوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی كەمن كاتێك

ژەهرەکە دەخۆمەوە زۆر لەگەڵتانا نامێنمەوە، بەڵکو بەجێتان دەهێڵم و دەڕۆم بۆ ئەو شوێنە خۆشەی کەوەسفی ناکرێ، وەك ئەوەی دەیڵێم و ئەوەی وتم بەلای ئەوەوە وونە، وەك ئەوەی من بمەوێ پرسە بۆ ئێوەو بۆ خۆم دانەنێم، کەواتە ببنە زامنم لای کریتون، بەڵام بەو رێگایەی کە زۆر جیاوازە وەك لەوەی کە ئەو دەیەوێ لەبەردەم دادوەراندا، لەبەر ئەوەی لەبری من وەڵامی دایەوە کە من هەمیشە نارۆم بۆ ئەوەی بخەوم بە پێچەوانەوە، لەبری من وا وەڵام بدەنەوە کە کاتێك مردن ئێخەم دەگرێ ئەوا دنیا بەجێ دەهێڵم، بۆ ئەوەی کریتون بە شێوەیەکی باشتر رووبەڕووی شتەکان بێتەوە، کاتێك دەبینێ بەدەنم دەسوتێ، یان لەژێر گڵدایە.

ئەوا با لەپێناو مندا خەمۆکی دای نەگرێ وەك ئەوەی من قوربانیەکی ئازارە گەورەکان بم، لەئاپۆڕەی بە خاك سپاردنمدا نەڵێ سوکرات لەسەر شانمە، دەیگوێزێتەوەو بەخاکی دەسپێرێ؟

لەبەر ئەوەی قسەی نا دروست ئەی کریتون هیچ بەدەستەوەدانێکی هەڵەی شتەکان نیە بەڵکو ئەوە شەڕێکەو ئێخەت دەگرێ دژی دەروونەکانە، پێویستە زیاتر ئازایەتیتان تیادا بێت و بڵێین کە تۆ بەدەنم بە خاك دەسپێریت، بە ئارەزووی خۆت بەخاکی دەسپێریت، بەو شێوەیەی کە لەگەڵ یاساکاندا دەگونجێن و خۆت پێت باشە، سوکرات لەگەڵ ئەم قسانەدا هەستاو بەرەو رووی ژوورەکەی نزیك کەوتەڕێ بۆ خۆشوشتن کریتون دوای کەوت و تکامان لەسوکرات کرد کە چاوەڕوانمان بکات، چاوەڕوان بووین بەهۆی ئەو یادەوەریانە کە پێش کەمێك پێی وتین و بۆی باس کردین، بەڵکو بەدوایدا چووین و باسی ئەو تێك شکانە ناخۆشیە مەترسیەمان دەکرد کە بە سەرماندا دێت، بەڕاستی خۆمان وا دەهاتە پێش چاو کە ئەو

منداڵانەین‌و باوکمان لێ وون دەبێت‌و ژیانی دوارۆژیان بە هەتیوی دەبەنە سەر دوای سوکرات، دوای ئەوەی لەگەرماوو خۆشوشتن دەرچوو، منداڵەکانی چوونە پێشەوە، سێ منداڵی هەبوو دوانیان بچووك بوون‌و سێ‌هەمیان بە تەمەن بوو، هەروەها خاتوونەکانی خانەوادەکەی چوونە لای لەبەردەم کریتون لەگەڵیاندا دواو فەرمانەکانی پێ دان،

دوای ئەوە فەرمانی دا ژن‌و منداڵەکانی. بچنە دەرەوە، دوای ئەوە سوکرات هاتە لامان‌و دانیشت، خۆر بەرەو ئاوایی دەچوو، دوای ئەوەی هاتەوە لامان لەسەر پێخەفەکەی راکشا ئەوەندە کاتی بەدەستەوە نەبوو بۆ ئەوەی شتێکی گرنگمان بۆ باس بکات، لەبەر ئەوەی خزمەتکاری یانزەهەم لەهەمان کاتدا هاتە ژوورەوەو لێ نزیك بووەوەو وتی: سوکرات، هیوام وایە ناچار نەبم بەوەی کە ئاراستەتی دەکەم وەك ئەو سزا ویژدانەی کە ئاراستەی خەڵکانی تری دەکەم، کاتێك لەوان نزیك دەبمەوەو بەیادیان دەهێنمەوە بۆ مەسەلەی بڕیاری ژەهر خواردنە وە ئەوا بە ڕوومدا هەڵدەشاخن‌و توورە دەبن‌و جنێوم پێ دەدەن، بەڵام تۆ ئەی سوکرات هەر لەو کاتەوەی کە هاتویتە ئێرە هەمیشە لەهەموویان ئازاترو نەرم‌و نیان بوویت‌و باشترین کەس بویت لەوانەی کە هاتونەتە ئەم بەندیخانەیە، لەم کاتەدا من بڕوام وایە کە تۆ رقت لەمن نیە، بەڵکو بێزاریت لەو کەسانەی کەتۆیان ئاوا لێکردو خۆشت چاکیان دەناسیت خۆت دەزانیت من نەهاتووم بۆ ئەوەی مژدەت بدەمێ، ماڵ ئاوا، هەوڵ بدە بەرگە بگریت بە خۆبە دەستەوە دانت،

دوایی ئەو پیاوەی قسەی بۆ سوکرات دەکرد کردیە پرمەی گریان‌و چووە دەرەوە، سوکرات وەڵامی دایەوە: هەروەها تۆش هیوادارم ماڵئاوایم قبوڵ بکەیت، ئەوەی

پێمت وت دەیکەم، دوایی سوکرات رووی وەچەرخان بەلای ئێمەداو وتی: سەیر بکەن چ رێزو حورمەتێك لەم پیاوەدا هەیە لەو رۆژەوەی لێرە بەندم دێتە لام‌و گفت‌وگۆم لەگەڵدا دەکات، چاکترین پیاوە، ئێستاش سۆزی بۆم دەجولێ‌و بۆم دەگری، دەی کریتون با فەرمانەکە بە شێوەیەکی چاك جێبەجێ بکەین‌و ژەهرەکەم بۆ ئامادە بکەن، گەر ئامادە نەکرا بێت، ئەوا خۆی هەڵدەستێ بە ئامادەکردنی، کریتون وتی: سوکرات وابزانم هێشتا تیشکی خۆرماوە لەسەر کەلی شاخەکان‌و ئاوا نەبووە بە یەکجاری، لەلایەکی ترەوە دەزانم کە زۆرن ئەو کەسانەی ژەهر دەخۆنەوە درەنگیان پێ دەچێت دوای ئەوەی فەرمانیان پێ دەدەن بەخواردنەوەی ژەهرەکە ئەمەش دوای ئەوەی کە بەئارەزووی خۆیان دەخۆن‌و دەخۆنەوە، هەندێکیان کاری خۆشەویستی‌یان کردووە، پەلەمەکەو هێشتا کاتمان بەدەستەوە ماوە، سوکرات وەڵامی دایەوە: ئەی کریتون ئەو کەسانەی کە تۆ باسیان دەکەیت‌و وا دەکەن ئەوا هۆکاری خۆیان هەیە، وای بۆ دەچن کە شتێك بەدەست دەهێنن، بەڵام من هۆکاری خۆمم هەیە کە بەو شێوەیەی ئەوان نەکەم، لەبەر یەك هۆ ئەویش ئەو کاتەیە کە زۆر بخۆمەوەو ببمە جێی گاڵتە بۆ خۆم، کاتێك دەمبینی کە چۆن ژیانم خۆش دەوێ بەشێوەیەك کە زۆر بەتوندی خۆشم ئەوا ئەو ساتەیە کە هیچ لەژیان نەما بێتەوە، ئا بەو شێوەیە (کریتون)ی ئازیزم ئەوەی پێت دەڵێم پێی هەستەو زیاتر ئازارم مەدە، لەم قسانەدا بوو کریتون بەسەر ئاماژەی بەو خزمەتکارە کرد کە لەنزیکیەوە راوەستا بوو، خزمەتکارەکە دوای کەمێك لەگەڵ ئەو کەسەدا هاتە ژوورەوە کە ژەهرەکەی ئامادەکرد بوو بۆ دەرخواردکردنی سوکرات،

لەپەرداخێکدا هەڵی گرتبوو، کاتێك سوکرات ئەوەی بینی پێی وت: زۆر چاکە ئەی هاوڕێکەم چ پێویستە لەسەرم بیکەم؟ تکات لێ دەکەم فێرم کە، پیاوەکە وتی: هیچ شتێ تەنها دوای ئەوەی ژەهرەکە دەخۆیتەوە بیێو بڕۆ تا ئەو کاتەی هەست دەکەیت کە هەردوو قاچت قورس بوون، دوای ئەوە لەسەر پێخەفەکەت راکشێ، ژەهرەکە لەخۆوە کاریگەری خۆی دەکات، دوای ئەوە پەرداخە ژەهرەکەی بۆ هێنا، سوکرات بێ دوو دڵی هەموو ژەهرەکەی خواردەوە، نەشڵەژاو رەنگیشی نەگۆڕاو بەشێوەیەکی دڵنیایی سەیری ئەو پیاوەی کرد، هەروەك عادەتەکەی خۆی بە دڵنیاییەوە سەیری خەڵکانی دەکرد، پێم بڵێ ئایا قەدەغەنیە تۆزێ لەو شەرابە پێشکەش بە خوداوەند بکەین؟ پیاوەکە وەڵامی دایەوە: سوکرات ئێمە تەنها ئەوەندە پڕ دەکەین کە بەشی خواردنەوەت بێت تێ گەیشتیت، سوکرات وتی: بەڵام یاسا ئەوەندە رێ دەدات کە لەخوداوەند بپارێینەوە بۆ ئەوەی ئەم گەشتەمان پیرۆز کات بەختیاری کات، ئەمەش ئەو داواکاریەمە لێی گەر وەڵامم بداتەوەو وبێ بەدەنگ داوا کاریەکەمەوە، دوای ئەوەی ئەمەی وت، پەرداخە ژەهرەکەی نایەسەر هەر دوو لێوی‌و بەهێمنی‌و بەبێ فیز ژەهرەکەی خواردەوە، تا ئەو کاتە هەموومان هێزمان دابە خۆمان کە فرمێسکەکانمان بەند کەین؟ بەڵام کاتێك بینیمان پەرداخە ژەهرەکەی برد بۆ دەمی‌و دوای ئەوەی خواردیەوە، نەما نتوانی ببینە گەورەو سەرداری فرمێسکەکانمان، سەرەڕای هەموو هێزو توانام فرمێسك لەچاوەکانم وەك لێشاو هاتنە خوارێ ناچار بووم بەپاڵتۆکەم دەموو چاوم بشارمەوەو بۆ ئەوەی بۆ خۆم بگریم، لەبەر ئەوەی بۆ کلۆڵی‌و داماوی سوکرات نەدەگریام، بەڵام بۆ داماوی خۆم دەگریام کە هاوڕێیەکی ئازیزم لەدەست چوو، کریتون نەیتوانی بەسەر

فرێسكەكانیدا زاڵ بێو بەندی بكات، (ابو للو دور) كە لەگریان ژێر نەدەبۆوە هاواری دەكردو دەینالاندو بە هەموو هێزێكیەوە هەنسكی گریانی دەهاتو دڵی ئامادەبوانی كردە گریان تەنها سوكرات نەبێ، چی دەكەن ئەی هاوڕێ چاكەكانم! نازانن ژنان چوونە دەرەوە بۆ ئەوەی كە ئەو شتەی كە بۆ پیاو ناشێ نەیبینن؟ وا گوێم لێ بووە كە خەڵكان هەمیشە دەڵێن پێویستە لەسەر مرۆڤ دەروونی خۆی تەسلیم بە ووشەی جوان بكات، بچن پشوو بدەنو زیاتر خۆراگری دەربخەن، كاتێك گوێمان لەووشەكانی سوكرات بوو شەرم دای گرتینو فرمێسكەكانمان شاردەوە لەو كاتەدا سوكرات بەژوورەكەدا دەهاتو دەچوو، دوایی وتی وا هەست دەكات هەر دوو قاچی قورس بوون، لەسەر پشت خۆی خستو راكشا بەو شێوەیەی كە پیاوەكە پێی وتبوو، لەهەمان كاتدا ئەو پیاوەی كە ژەهرەكەی دایە لێی نزیك بووەوە، پێو هەر دوو قاچی پشكنی، بەتوندی فشاری خستە سەر هەر دوو قاچیو لێی پرسی، سوكرات هەست بە قاچەكانت دەكەیت؟ سوكرات وەڵامی دایەوە: نەخێر، دوای ئەوە فشاری خستە سەر هەر دوو قاچی ئەو جا هەر دوو دەستی بەرز كردەوە بۆ سەرەوە، بەدەنی وورد وورد وشكو سارد دەبوو، بە بەردەوامی دەستی لێ دەداو پێی وتین دوای ئەوەی ئەم ساردیە دەگاتە دڵی سوكرات ئەواماڵئاواییمان لێ دەكات، سەرسكی سوكرات سارد بوو، سوكرات خۆی هەستی بەوەكرد لەبەر ئەوەی سكی داپۆشرا بوو، ئەمەش دوا قسەی سوكرات بوو وتی: كریتون پێویستە لەسەرمان كە كەڵەشێرێ بدەیت بە ئەسكولاب! لەبیرت نەچێ ئەم قەرزەم بۆ بدەیتەوە، كریتون وەڵامی دایەوە، وا دەكەم ئایا هیچی ترت هەیە بیلێیتو وەسیەتم بۆ بكەیت، سوكرات هیچ وەڵامێكی نەبوو، دوای كەمێك جوڵەیەكی توندی كرد، پیاوەكە

چەرچەفەكەی لەسەر لاشەی سوكرات لابرد، سوكرات هەر دوو چاوی بەكراوەیی بوو، كریتون هەستی بەوە كرد بۆیە هەر دوو چاوی‌و دەمی سوكراتی داخست. بەو شێوەیە سوكرات لەیەك ساتدا چۆن چووە نێو مردن‌و نەمرییەوە، كاتێك بڕیارەكە جێبەجێ كرا، ئەسینییەكان هاتنەوە هۆش بۆ ئەو تاوانەی كردیان، ئەو هاوڕێیانەی سوكرات كە خۆیان شاردبۆوە چوونەوە نێو خەڵك‌و قسەو گفت‌و گۆكانی سوكراتیان بەشێوەیەكی كاریگەریانە باس دەكرد، بەپێی قسەی (دیوجین لابرس) ئەسینییەكان لەشوێنە مەشقەكان‌و لەشوێنی بۆ كسێن‌و لەشوێنی یاری‌یە وەرزشەكاندا پەژارە دای گرتن، (انینوس) یان ناردە مەنفاو دووریان خستەوە كە ئەو ڕۆژە هاتەوە شارو خەڵكی هیراكلی دەریان كرد لەشار، بڕیاری مردنیشیان بەسەر (میلیتوس)دا دا بەمردن، پەیكەرێكیان لەبرونز بۆ سوكرات دروست كرد كە لەلایەن (لیسیبوس)ەوە دروست كرا بۆ نەمری سوكرات دواجار ناوی بووە هێمای حیكمەت‌و عەقڵ‌و چاكەكاری كە قوربانیەكانی چاكەن بۆ گەمژەیی بە كورتی یەكێك بوو لەو بەشەرە ئەفسانانەی كە زۆر سەرسوڕهێنەرن.

# فەلسەفە

١- کەمێك شارەزاو نزیك بووینەوە لەوەی کە چۆن سوکرات ژیاو چۆن مرد. ئایا زۆریە باشی ئەوە دەزانین کە بیرکردنەوەی چۆن بوو؟ لەو بارەیەوە سوێندی (ئەفلاتۆن‌و کسینوفون)مان لەبەر دەستایە لەبەشی یەکەمدا دەربارەی ئەو یەدەکە پێویستیانە قسەمان کرد بۆ ئەوەی خۆمان دوور خەینەوە لەوانەی دەبنە هۆی هەڵخەڵەتاندنمان. بێ گومان کە حەکیم ترین ڕەفتار لای کسینوفون دەست دەکەوێ دوای دەربارەی لیستی بیروباوەڕی سەرەکی سوکرات، وەك دەردەکەوێ دوای پشکنینی گفت‌وگۆکانی ئەفلاتۆنی سوکراتی هاوپەیمانیەك بەدی دەکەین لەنێوان (ئەفلاتۆن‌و کسینوفون)دا دەربارەی بیروباوەڕی سوکراتیانە، بە هەموو ئەگەرێکەوە وای دادانێین کە ئەو بیروباوەڕانە دەگەڕێتەوە بۆ سوکرات، بەڵام شایەتێکی وورد بین نەبوون، هەر وەك وتراوە کورت کراوەو راستگۆیی باوەڕەکانی سوکراتیان تۆمار کردووە، بەو شێوەیە دەتوانین پەیمان لەسەر بیروباوەڕی سوکراتیانە بدەین، ڕێگای ژیانی کە خۆی پابەند بوو پێوەی باسکردنێکی پاراوە بۆی، بەڵام هوشیاری ناگەیەنێت گەر قسە لەسەر (سیستەمێکی سوکراتی) لەخۆگرتوی گونجاو و ڕێك‌و پێك بکەین.

٢- باوەڕی سوکراتیەت وا سەری هەڵدا کە کاردانەوەیەکی دژی ڕێگای بیرکردنەوەی ئەوانەی پێشو کە لەیۆناندا هەبوو پێش سوکرات، دوو کۆمەڵ لەفەیلەسوفان لەئارادا بوون کە ئەو سەردەمە ڕوویەکی گەشیان هەبوو،

١ـ كۆمەڵی میتافیزیکە دۆگماكان هەریەکە لەو فەیلەسوفانە لەرێگای خۆیانەوەو بە بیروباوەڕی تایبەتیانەوە هەوڵیان دا کێشەی سروشتی گەردوون چارەسەر کەن، ریشەی گەردوون، چارەنووسی، تیۆر دابنێن دەربارەی ئاسمان دەربارەی زەوی‌و دەربارەی مرۆڤ.

٢ـ کۆمەڵێکی دی کە سوودیان ئەوەندە نییە، رەخنەگر بوون، دوای ئەوەی دژ بەدژەکانی میتافیزیکی‌یەکان بێداربانی کردنەوە، هەوڵی پرسیارکردنیان داوە وەك: ئایا بە راستی بیروباوەڕی بە شەری دەتوانێ کێشە بەربلاوەکان چارەسەر بکات، کە لەخۆیان دەپرسن‌و بە نەخێر وەلامیان دەدایەوە، کۆمەڵی یەکەم کە نوێنەری قوتابخانە جیاوازەکان بوون‌و نەیا نناسین‌و تەنها لەبڕگەو ئەو شرۆڤانەدا نەبێ کە نەیارەکانیان یان مێژوو نوسان ناویان هێناون وەك:ـ

یەکەم/ فەیلەسوفەکانی قوتابخانەی ئایۆنیەکان بلیمەتترینیان طالیس، انا کسیماندر، انا کسیمان، دیوجین، أبو للونی، هیر قلیط، ئەوانە وای بۆ دەچوون کە گەوهەری شتەکان ناوەو لای طالیس هەروایەو لای انا کسیماندرو دیو جین‌و ابو للونی گەوهەری شتەکان کۆتایی نی‌یەو سنووردار نەکراوەو شێوەیەکە لەتێکەڵ ئەمە لای انا کسیماندر، لای هیر قلیط ئاگرە، بە پێی ئەگەرەکانیان سیستەمێکی کورتکراوەیان دانا کە چۆن هەموو شتێك لەتوخمی سەرەتایی گریمانە دەرچوو، یان بەگواستنەوە یان بە هۆی پارچە پارچە بوونی بەشە تێکەڵ کراوەکان، ئەم تیۆرە کۆی خالّی دەرچوون بوو بۆ بینینی ئاسمان بەجولّەکەیەوە، هەروەها بۆ زەوی کە سەنتەری گەردوونی ناجولّەیە،

لەگەڵ ئەو تەنانەی کە تێی دان هەروەها گژوگیاو ئاژەڵ‌و بەشەریش؟

دووەم/ فیزیاییەکان جیاواز بوون لەو رایە، جیاوازییەکی قوڵ، فیتا گۆرس‌و قوتابییەکانی باوەڕیان وا بوو کە دواگەوهەر لەتوخمی مادیدا نیە، بەڵکو لەو حەقیقەتە باڵایەدا پێك دێت کە بە ژمارە نایەت، دوای ئەوەی کە ئەم نمونەیان دانا وەك: توخمی نێر یەك ژمارەیەو توخمی مێ دوو ژمارەیە، ئەنجامگیریان بەدەست هێناکە مارەکردن لەیەکتری یەککگرتنی توخمی نێرو مێ دەکاتە ژمارە (٣)، لەمەشەوە ئاگادار بوون کە دادپەروەری ئەوەیە واتە ئەوەی براوە بەیەکسانی بگەڕێتەوە، بەمەش یەکسانیان کرد بە ژمارە چوار یەکەم بەدەست هێنی لێکدان بوو بە یەکسانی (دوان) لەگەڵ (دوان)ی یەکساندا ئاواو بەو شێوەیە؟

سێهەم/ فەیلەسوفانی قوتابخانەی (ئیلییەکان) هەڵوێستێکی تریان گرتە بەر، کسینوفان، برمینید، زینون ئیلی خۆیان دایە دەست تێ رامانی رووتەوە، تێ رامان لەچەمکی قەوارە - گەردوون، وای دادەنێن‌و بەڵگەشیان پێیە کە (زۆر)و (جوڵە) بونیان نیە، ئەوا نە تەنها دیاردەی وەهمین، لەواقیعدا نابێ قەوارە لەگەڵ نا قەوارەدا هاوبەش بێت، کەواتە ئەو تەنها بونەوەرێکەو هیچی تر، دوایی ناتوانێ لەشتێکی ترەوە سەرچاوە بگرێ، ناتوانێ لەقەوارەوە دەرچێ لەبەر ئەوەی خودی خۆی قەوارەیەو لەناو قەوارەشدا نابێ لەبەر ئەوەی بوونی نیە،

لەلایەکی ترەوە ناتوانێ ببێ بەشتێك، ناتوانێ ببێتە قەوارەیەك لەبەر ئەوەی بوونەوەرەو ناشتوانێ ببێتە نا قەوارە لەبەر ئەوەی بوونی نیە، (زینون ایلی)ش هەندێ بەڵگەی یەکلایی کەرەوەی هێنایەوە دژی (زۆر)و (جوڵە) بۆ دەرخستنی مەحاڵەکانیان.

چوارەم/ دوای ئەوەی ئەو تیورە كرچو كاڵانەی پێشوو نەمان تیۆری تر سەریان هەڵدا، وەك تیۆری امیدو كلیس، بەسەركەوتنی ئەو خۆشەویستیو كینەیەی كە یەك لەدوای یەك، یەك دەگرنو جیا دەبنەوە لەیەكتریو ئەو توخمانەن كە گەر دونیان لێ پێك هات، تیۆری انا كساگور لەگەڵ (بەشە لەیەك چووەكان)و (ئاوەزی) رێكخەری شتەكان بە هۆی كۆكردنەوەی بەشە لەیەك چووەكانەوە دروست دەبێت، تیۆری لوسیبو دیمقریط كە هەموو شتەكان بە ئەتۆمەكان، بۆشایی، كەوتنو هەڵپەسێروكان شی دەكاتەوە، ئەو تیۆرانە مۆركی شیعریان پێوە دیارە لەناوەوەو لەدەرەوە، كە بەشێوەیەكی ساكارانە رێكیان خستووە، كۆمەڵەی دووەم لەفەیلەسوفەكان سۆفستە تائیەكانە، بروتا گوراسو گورجیاس بە ناوبانگترینیانن هەموویان كۆكن لەسەر ئەوەی كە بایەخی فێربوونە میتافیزیكیەكان رەت دەكەنەوە، پێش وەرگرتنی هەر هەڵوێستێكی میتافیزیكی یانە،

بانگەوازمان دەكەن بۆ پشكنینی ئەوەی هەمانە لەوزەی ئەپستمۆلۆژیو ئەو كەرەستانەی كە بەڵگەدارن، ئەو ئەركەی كە هەوڵیان بۆ دەدا وای كرد كە لاسایی كردنەوەیان زەحمەت بێت، بروتا گوراس دەنووسێو دەڵێ: مرۆڤ پێوانەی هەموو شتەبونەوەرەكانە لەبەر ئەوەی بونەوەرە، ئەوەشی كە بوونەوەر نییە، ئایا ئەمە هەر ئەوە نیە كە گومانكارە گەورەكانی سەدەی كۆنو نوێ بانگەشەیان بۆ دەكرد، ئەوانەی هەمیشە دووبارەی دەكەن كە پرسیارەكانمان پرسیاری مرۆڤنو ئێمە خاوەنی هیچ شتێك نین تا بتوانین بڕیاری لەسەر بدەین تەنها دیكۆمێنتە مرۆییو بەدیهیاتە مرۆییەكان نەبێت، دڵنیا نابین لەخۆمان بۆ ئەو چارەسەریانەی كە

دراون تەنها بۆ سروشتی هەستەکانمان‌و ڕێگاکانی بەشەریمان نەبێ بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی شتەکان.

واتە کێشەیەکی دەلالیەو جەختی لەسەر کراوەتەوە، گورجیاس دەڵێ:

١ـ هیچ شتێك نیە؟

٢ـ گەر شتێك هەبێ ناتوانین بیناسین.

٣ـ گەر شتێك هەبێت‌و توانیمان بیناسین ناتوانین ناسینمان بگەیەنینە ئەوانی تر، لەبەر ئەوەی ووشەکان کە واتایەکی هەیە بۆمان مانایەکی تر هەڵدەگرێ بۆ ئەوانی تر کە جیاوازبێ لەماناکانمان.

لەم گومانە تەواوەوە، سەفسەتائیەکان ئەنجامگیریەکی بەرجەستەی مەترسیدار دەردەهێنن، ناتوانین هیچ ڕاستییەك بزانین، تاکە لێکۆڵینەوەی بایەخدار کە دەتوانین لەرێگایەوە ئەوانی تر قەناعەت پێ بهێنین، گەر بتوانین سەرکەوتن بەدەست بهێنین بەسەریاندا، گەورەیمان، بە هەرحاڵ ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە ئەم هونەرەمان فێر دەکات زانستی بەیان‌و ڕەوان بێژیە، تاکە زانستەکە گرنگی پێ دەدەین،

ئەمە ئەوەیە کە سوکرات زانی، بەختی بوو بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی هزرەکانی‌و هەوڵی بۆ ئەوەدا، گەر باوەڕ بە شۆڕشەکەی کسینوفون نەکەین دژی درۆ هەڵبەستراوەکانی میتافیزیکیەکان‌و دژی ئیحای سۆفسەتائیەکان، کە چاك دەیناسین (لبرو دیکوس) یەکێك بوو لەقوتابییەکان‌و یەکێك بوو لەسۆفسەتائیەکان، ئەوا پێش هەر شتێ سێ نا تەواوی لەکاری ئەو میتافیزیکیانەی کە بیریان لەسروشت‌و لەئاسمان کردەوە دێتە ئاراوە،

كارێكی مەحاڵەو ئەو دیكۆمێنتانەی كە لەبەر دەستماندایە بێ سوودەو هیچ خزمەتێكمان پێ ناگەیەنێ بۆ ئەو مەبەستەی كە دەمانەوێ، تەنیا زیاتر رێكخستنی ژیانمان نەبێ، ئەمە زەندەقەیەو گلاوكردنی هەر كۆششێكە كە هەوڵ دەدات ئەو نهێنییانەی خوداوەند لێی شاردونیەتەوە ئاشكرای بكات، لەبری لێكۆڵینەوە دەربارەی سروشت هەر وەكو هەندێ كەس پێی هەڵدەستن كسینوفون دەنوسێو دەڵێ: لەبری لێكۆڵینەوە دەربارەی ئەو رەچەیەی كە سۆفستەتاییەكان پێی دەڵێن جیهانو ئەو هۆكارە پێویستییانەی كە تەنە ئاسمانیەكانی هێنایە كایەوە لەگەمژەییەوە بەڵگەیان بۆ ئەو تیۆرانە دەهێنایەوە، وا دەركەوت گرنگیان بەو كەرەستانە دەدا بۆ باوەڕ پێكردن بەو شێوەیەی كە ئەوان سوودیان لەو زانستە بەشەریە وەرگرتووە یان حیكمەت لەوەدایە كە ئەوەی لەنێو دەستی بەشەردایە بۆ قبوڵبونەوە لەنهێنیەكانی خوداوەند بێ بایەخ بكرێ، بەڵام دەربارەی تەنە ئاسمانیەكان (وایان دەبینی كە خەڵكان ناتوانن ئەم نهێنییانە دەرك پێ بكەن، بەڵكو لەقوڵایی ناخیانەوە قینیان لەشتە شاراوەكانی خوداوەندەكانیان دەبووەوە، ئایا ئەنجامگیری ئەوە بەدەست دەهێنین كە سۆفسەتائیەكان راست بوونو بیرمان ناتوانێ دەرك بە هیچ شتێ بكاتو تەنیا لێكۆڵینەوە كە بایەخی پێ دەدەن هونەری ووتە بێژییە بەو جۆرەی كە زانا بەیانەكان دەیانەوێ؟

سوكرات ئەم بابەتەی بە تەواوی یەكلایی نەكردەوە هەر وەك چۆن لەپێشدا پێی هەڵدەستا،

گەر ئێمە نەتوانین هیچ شتێك لەسیستەمی میتافیزیكی فەلەكی بزانین ئەوا لەتوانامانداپە ئەو چەمكە سەرەكیانەی كە مانای ژیان دەبەخشن وەری بگرین، وەك

زانینی ئاوەزی خێرو شەڕ جەخت کردنەوەش لەسەر ئەوەی کامە دادپەروەرییەو کامەش ستەمە، دۆزینەوەی سروشتی جوانیو سروشتی ناشیرین بەکورتی دەبێتە زانینێکی کردارەکی رێکخراو بۆ رەفتارمان، زانایانی رەوانبێژی قسەیان زۆر پێ بوو، وا پێویست بوو لەسەریان کە هەندێ شت نەڵێنو تەنها سەیری هەندێ کێشە بکەن،

کسینوفون دەنوسێ: بەڵام بۆ مەسەلەی سوکرات، مەینەت وە بیر هێنانەوەیە ئەوەی لەنێو خەڵکدا دەوترێتەوە،

سوکرات خێرو شەڕو شەرمەزاریو دادپەروەریو ستەمی دەپشکنیو دەست نیشانی دەکردنو هەروەها حیکمەتو گەمژەییو ئازاییو بێ دەسەڵاتی لەسەر چی بینا دەکرێ، دەوڵەت چییەو پیاوی دەوڵەت چۆنە، بڕیار چییەو چۆن جڵەوی کاری باشە بکەین، دواجار دەربارەی ئەو زانستانەی کە مرۆڤی چاکە پێی هەڵدەستێ ئەمانەی هەموو ساغ دەکردەوە. بەبێ ئەوانەش سوکرات وای دەبینی کە ئێمە بەراستی بێ ئەوانە ناوی کۆیلەمان بەسەردا دەبڕێ، هەموو میتافیزیکێ مەحاڵەو تەنیا دەبێتە درۆ هەڵبەستێك بۆ شتە پڕوپوچەکانی وەهم،

بەڵام توانای کارێکی هەیە کە دەست بەرداری نەبین،

ئەویش دانانی ئەفراندنی عەقڵە،

ئەمە ئەو بیروباوەڕە سەرەتاییەی سوکراتیەتە، کەواتە چۆن ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکرێ؟ سوکرات کوڕی دایکێکی مامان بوو، ئەو زانینەی کە لەپیشەکەی دایکی بەدەستی هێنا وێنەیەکی رۆشنی بۆ کارەکانی بەدەست هێنا، ژنێك منداڵی لەنێو سکیدا هەڵگرتووە، وا پێویست دەکات کە ئەو منداڵەی ببێ، لەهەموو

بارودۆخێكدا منداڵ بوونەكە بەشێوەیەكی باش لەدایك نابێ، گەر یاریدەدەرێكی نەبێ، بە هەمان شێوە ئەو چەمكە فەلسەفیانە لەدایك دەبن كە رەفتاری مرۆڤەكان رێك دەخەن، لەوانەیە خاوەنی زێرێك بین بێ ئەوەی هەست بەبونی بكەین یان دایمەزرێنین،

هەموومان بەهێزەوە بیروباوەڕەكانی بابەتی باسكراو هەڵدەگرین تەنیا ئەوەمان لەسەرە كە بیهێنینەوە هۆش، خۆمان هەڵگری ئەو كۆرپەیەین كە راستییەكانی كرۆكی ئەفراندنە، بەڵام پێویستییە لەدایك بوون هەیە، سوكرات ویستی ببێتە ئەو مامانە (مایوتیك) دەستی كر دبە (مامانی كردنی زەینەكان)، ئەوە چییە كە رێگرە لەبەردەم مرۆڤدا بۆ دۆزینەوەی ئەو راستیانەی كە هەن لەتاقی كردنەوەكانیاندا؟

ئەوەیە كە ناگەڕێن بە دوای راستیەكاندا، ئەم حاڵەتەش واتە گەر نەگەڕێن بە دوایدا، لەبەر ئەوەی ئەوان وای دەبینن كە دەركی پێ دەكەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان نایزانن، مەرجی یەكەم بۆ لەدایك بوونی زەین، هەستانە بەهەڵگرتنی یان لەخۆگرتنی هۆشیاری نەزانینییەوە، بۆ نمونە: پێناسەی ئازایەتی چییە؟ بابگەڕێین بە دوای گفتوگۆكەرێكداو پرسیاری لێ بكەین: ئازایەتی چییە؟ گفتوگۆكەر وای بۆ دەچێ كە وەڵامەكەی دەزانێو زانایانە بۆی دەچێ لەوانەیە پێناسەكەی هەڵە بێت، پێش هەموو شتێ دەبێ رێی هۆشیاری خۆی پێ نیشان بدەین، گەر پێناسەمان خستە ژێر چەند حاڵەتێكی بژاركراوەوە ئەوا سەركەوتوو دەبین لەئەركەكەمان، بۆ نمونە پرسیاری لێ دەكەین:

ئایا ئەو کەسەی لەجەنگ هەڵدێ ئازایە؟ ئایا ئەو کەسەی کار ناکات ئازایە؟ ئایا ئەو کەسەی رووبەڕووی شتێکی مەترسی دەبێتەوە بەبێ تۆپزی ئازایە؟... هتد، گەر هەڵەیەك دەرکەوت لەو پێناسە پێشنیار کراوە بەو شێوەیە ئاگاداریەکەی کۆتایی پێ دێت، بەو شێوەیە زەین پاك دەکرێتەوە لەو هەڵەیەی ئارامی پێ دەبەخشێ، یەکەم سات ساتی (گاڵتە پێ کردنە) لە لەدایك بونی سوکراتیەتدا. بەڵام تەنیا پاك کردنەوەی زەین بەس نیە، بەو کردەوەیە وامان لێ کرد کە کۆشش بکاتو بیربکاتەوەو چارەسەرێکی داواکارانەمان پێ نەدا هەندێ نمونە دەخەینە بەر دەستیو پێی دەڵێین کە جیاوازی بکات لەنێوانیاندا، دوایی بەرەو ئەو ئەنجامگیریەی دەبەین کە ئەو هاوبەشی‌یە لەجۆرەکانی کردەوەکاندا کامانەن کە بە ئازایەتی ناوی دەبەین، بەو شێوەیەو بەهۆی تێ خوێندنی پرۆگرامیانەوە هەر لەخۆوە دەرك بەو جیاوازیە دەکات لەنێو بێ دەسەڵاتو مەردو ئازادا، بەمەش ئەنجامگیری ئەوەمان دەست کەوت کە بە دوایدا دەگەڕاین چ بۆ خۆمانو چ بۆ گفتوگۆکەر، واتە ئەو داڕشتنە ئەبستکراتەی کە ناوەڕۆکی ئازایەتیمان بۆ کورت دەکاتەوە، رێمان پێ دەداتو بڵێین کە ئەو بڕیارانە تەواونو راستن، هەروەها هەستان بەکاری تەندروست بۆ پراکتیزە کردنی.

با نمونەیەك بهێنینەوە کە لە (کسینوفون)ەوە وەرگیراوە:

مشتو مڕی بابەتەکە لەسەر دادپەروەریەو (پێچەوانەکەشی ستەمە) ئایا دەتانەوێ لێرە (د) بنوسینو لەوێ (س)ین بنوسین؟ ئەوەی کرداری دادپەروەریە لەژێر (د)دا دای دەنێینو ئەوەشی کرداری ستەمە لەژێر (س)دا دای دەنێنین ئەگەر

ئـەوەتان بەباشـی زانـیو پێویسـت بـوو ئـەوا بیكـەن) سـوكرات جـوانی هـەر دوو پیتەكەی نوسیو مەسەلەكەی دووبارە كردەوە،

ئایا درۆ لای خەڵكان بەدی ناكەین؟ بەڵێ ـ لەكوێ داینێنین؟

بە روونی دیارە لەژێر پیتی ستەمدا ـ ئایا خەڵكان هەندێكی تریـان ناخەڵـەتێنن؟ بێ گومـان، هەڵخەڵەتاندن لەكوێ دابنێین؟ لەژێر ستەمكاریدا بەدی دەكـەینو دای دەنێین، زیان بەكەسانی تر دەگەیەنێت؟ هەمان شتیشە ـ فرۆشتنی پیـاوێكی ئـازاد وەك كۆیلە؟ هەمیشە هەمـان شتە ـ هیچ شتێك لـەو كردەوانـە لـەژێر دادپەروەریـدا نـابینین؟ ئەمـە كـەمێك نامۆیـە ـ بـەڵام چـی؟ بـاوای دابنـێین كـە سـەركردەیەك نەتەوەیـەكی سـتەمكارو شـەڕخوازی مـل كـەچ كـرد: ئایـا دەبـێ بڵـێین كـە ئـەو سەركردەیە ستەمكارەو ستەمی كردووە، بەراستی نەخێر ئەو كارەی دەیكات نـاوی دەنێین دادپەروەری؟ بێ گومـان، گەر دوژمـنی هەڵفڕیواند، ئەمـەش دادپەروەرییـە، بەڵام گەر شاڵاوی بردە سەر ناوچەكەیانو بەرەكەتەكەی لـێ بردن؟

لەكارێكی دادپەروەریانە زیاتر شتێكی تر ناكـات، وای بـۆ چـوم كـە پرسـیارەكەت لەبازنەی مامـەڵە كردنی بێ لەگەڵ هاوڕێداو لەوە دەرنەچێ، بەو شـێوەیە نمونـەمان هێنـایەوە بۆ ئەوانەی دەچنە ژێر بارەوە، پێویستە ئێستا ئـەو شـتەی هەیـە بیخەینـە ژێر دادپەروەرییەوە، واپێ دەچێ، ئایا دوای ئەو پۆلێن کردنە ئارەزوو دەكەن بە پێی باوەڕ جەخت لەو كردەوانە بكەیتەوە كە دادپەروەرانەن دژی دوژمـنان،

بەڵام ستەمە لەگەڵ هاوڕێكاندا، پێویستە لەسـەرمان لەگـەڵ هاوڕێكانـدا زۆر بـە راستگۆیی مامـەڵە بكەین؟

ئێمە لەسەر هەمان پەیمان نین ـ سوكرات كەوتەوە كایەكەوە:

گەر پێشەنگێك سەربازەكانی ببینێ دەترسن‌و دەیانەوێ دەربازبان بێ پێشەنگەكەش باوەڕیان پێ دەهێنێ كە یارمەتی بە ڕێگاوەیەو دەگات، بەم درۆیە ڕۆحی ترساویانی دڵنەوایی كردەوە، بە چ شێوەیەك سەیری ئەم فێڵە دەكەیت؟، لەژێر چەمكی دادپەروەریدا دایدەنێم، وا بزانم، گەر منداڵێك پێویستییە دەرمان بوو رەتی ئەكاتەوەو نایخوات ئەوا باوكەكە لەگەڵ خواردندا دەیداتێ، بەم فێڵە تەندروستی بۆ منداڵەكەی دەگەڕێنێتەوە، ئەم فێڵە لەكوێدا دانێین؟ یان چۆن سەیری ئەم فێڵە بكەین؟ لەهەمان شوێندا ـ برادەرەكەم لەژیان بێزار بوو، ئەترسم كە خۆی بكوژێ، شمشێرەكەی‌و هەموو چەكەكانی دەدزم، چی بڵێین بەم دزییە؟ ئەوە دادپەروەرییە، تۆ وا دەڵێی كە هەتا لەگەڵ هاوڕێكانماندا ناچار نین كە بەڕاستی بدوێین لەگەڵیاندا؟ نەخێر، بەیارمەتیت ئەوەی كە پێشوو وتم دەیكێشمەوە، ئەوەی دەیكەیت زۆر باشترە لەوەی كە بەردەوام بیت لەهەڵەكردندا) لەپەیڕەوو پرۆگرامەكەدا دەیالۆگ‌و گفت‌وگۆ دەبینن، لەشوێنە گشتییەكان لەژێر گومەزەكانی ئەسینادا، سوكرات لەگەڵ قوتابییەكانیدا لەو شوێنانە گفت‌وگۆی خۆی دەكرد بەشێوەیەكی ژیرانەو سیحرانە، هەمیشە قوتابییەكانی لەدەوروبەری بوون.

تەنانەت دوژمنەكانیشی لەدەوری بوون، سوكرات چی لەو پەیڕەوو پرۆگرامەی بەدەست هێنا. پێش هەموو ئەو بیروباوەڕانە: ئەوەی بیەوێ كارێكی چاكە بكات پێویستە لەسەری كە (خۆی بناسێ) خۆت بناسە، لەهەڵكەوتدا جیاوازی سەیر هەیە لەنێوان ئەوەی خۆی دەناسێ‌و ئەوەی خۆی ناناسێ، ئەو مرۆڤەی كە خۆی دەناسێ ئەوا خۆی ناسی، دوایی، چ خێرو شەڕێك هەیە بۆی، ئەو مرۆڤەی خۆی ناناسێ

لەخێرو شەڕ نازانێ، کەواتە یەکەجار ئەوە دەزانێ کە ئەو کردەوانە چین کە لەبارستایی خۆیاندان،

ئەوانەش چین خۆیانی لێ لادا بۆ ئەوەی ببێتە حەکیم، دووەم ئەو هەموو شتە نازانێ بە شێوەیەکی هەڕەمەکی تێك‌و پێکی دەدات، خێر دەمێنێتەوەو دەکەوێتە ژێر خراپە، کەواتە پێویستە گەر بەراستی بمانەوێ چاکە بکەین،

باووشیاریەکی تەواومان هەبێ بۆ ئارەزووکانمان‌و ووزەکانمان، گەر ئەوە نەکەین، ئەوا خراپە رادەوەستێ بەرامبەرمان، (ئوتیدیم، پێم بڵێ، ئایا رۆشتویت بۆ دلف؟ بەڵێ دووجار چووم، ئایا لەسەر بەردەکە ئەو نەقشەت خوێندۆتەوە کە دەڵێ (خۆت بناسە) - بەڵێ - بۆت روون نیە کە ئێمە سوود لەم زانینە وەردەگرین‌و رووبەڕووی گرفتی گەورەترین خراپە دەبینەوە کاتێك گاڵتە بە خۆمان دەکەین؟ ئەوەی خۆی بناسێ ئەوا دەزانێ کەچی بە سوودە بۆی؟ لەوەدا جیاوازی دەردەخات کە هێزی خۆی توانای هەڵگرتنی چەندەو چی رەت دەکاتەوە، تەنیا بەوە کار بکات کە تەنها دەیزانێ، ئەوا پێویستی بەدەست هێناو بە بەختەوەرەی ژیان دەباتە سەر؟

گەر خۆی لادا لەوەی کە نایزانێ ئەوا دەرك بە هەڵەکان دەکات‌و لەناخۆشییەکان رزگاری دەبێت، بەڵام ئەوەی خۆی نەناسێ‌و ووزەی خۆی بەکاربهێنێ ئەوا نازانێ چۆن بڕیار بەسەر خەڵکاندا یان شتەکاندا بدات، بە هیچ شێوەیەکیش نازانێ چی پێویستەو چیش بکات‌و ئەو کەرەستانەش کە بەکاری دەهێنێ ناگونجێ لەگەڵیدا لەهەموو شتێکدا هەڵدەخەڵەتێ‌و هەل لەدەست خۆی دەدات‌و کارەسات بە هەلاکەتی دەبات، کەواتە ئەو خۆماندووکردنە چیمان بۆ دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی خودی خۆمان بناسین دەربارەی ئەو راستییە کە لەبەرچاوان بێت، مرۆڤ بایەخ پێدانی

سەرەكی خۆی هەیە: ئەویش گەیشتنە بە بەختیاری كەواتە ئەوەی كە پێویستە فێری بێ، هەندێ رێگەیە كە فرسەتی بەختیاری پێ دەبەخشێ (بەدەست هێنانی پێداویستییەكانی بێ راكردن و هەڵپەكردن بەدوایدا، ئەمەش ناو دەنێم شانسێكی بەختیار، بەختیاری و زانستی بەدەست هێنا. بەبڕوای من ئەمەیە رەفتاری دروست، بەوانەش دەڵێم كە هەمان رێ دەگرنە بەر ئەوا ئەوانە بەشێوەیەكی باش رەفتار دەكەن. بەلام ئەو ئاراستەیە چییە كە بتوانین ئەم ئەنجامگیرییە بەدەست بهێنین؟ بەروونی دەركی پێ ناكەین تا ئەو كاتەی كە خاوەنی چەمكێكی راستگۆیانە نەبین بۆ بەختیاری، بە هەرحاڵ ئەم بابەتە لای خەڵكان وەك وەهمێكی بەرجەستەكراو لایان دروست دەبێ، بەختیاری نە لەجوانی و نە لەهێزو نە لەسامان و نە لەشكۆمەندیدایە لەهیچ شتێك لەوانەدا نییە (بێگومان سوكرات بەختیاری چاكەیە - بەمەرجێك ئەی ئەو تیدیم بەفیرۆیان نەدەین لەكارە ئاڵۆزەكاندا، ئا: ئەو شتە چییە كە بەختیاری دێنێتە ئارا، جوانی، هێز، دەوڵەمەندی، شكۆمەندی و هەزار شتی تر كە لەوانە دەچن، بەراستی لەگەڵ یەكتردا كۆیان دەكەینەوە، ئەدی چۆن بێ ئەوە بەختیار دەبین؟ باشە، گەر دەتەوێ لەگەڵ بەختیاریدا ئەو هەموو چاكانەی كە زۆر جار زیان بەخشە تێكەڵی بكە! چەند جار ساختەچییەكان جوانیان شێواندوە، زۆر كەس كلۆڵ بوون و بەهەڵەدا چوون دوای ئەوەی پرۆژەكانیان گەورە كرد وای بۆ دەچوون كە بەهێزوبە پشتیوانی خۆیان دەیكەن، چەند كەسی تر دوای ئەوەی بەهۆی دەوڵەمەند بوونەوە تەمبەڵ بوون و كەوتنە دوای ئەوان! چەند لەخەڵكانی پرشنگدار سەركەوتن و شكۆداری و فراوانی ناوداریێتی یان بزربانی كرد، نەخێر! هیچ تۆخمێكی مادی نییە لەبەختیاریدا، لەبەرهەمی شتێكی ترەوەیە، لەبەرهەمی ساز كردن و

گونجاندن لەنێوان ئارەزووەکانمان و رەوشماندا سوکرات ئەم مەسەلەیە بەگفتوگۆ لەگەڵ ئەنتیگون روون دەکاتەوە کە کسینوفون بۆی ئامادەکردوین، ئەنتیگون سوکرات بەوە تاوانبار دەکات کە (مامۆستای کلۆڵی)یە، (ئەی سوکرات وام زانی ئەوانەی کە فەلسەفە دەکۆڵنەوە لەخەڵکانی تر زۆر بەختیار ترن بەڵام وا بۆم دەردەکەوێ کە تۆ بەپێچەوانە گوڵبژێر دەکەیت لەحیکمەتدا، گەر ئەوەی بۆ خۆت بەکاری دەهێنی و بیدەیتە کۆیلەیەك ئەوا بەهیچ شێوەیەك لای گەورەکەی نەدەمایەوە، بەوشکترین خواردنی سەر سینی و بەقێزەوە ترین خواردنەوە رازی دەبین، پاڵتۆیەکی شڕو داڕو بۆت دەست نایە لەهاویندا وەك چۆن لەزستاندا خزمەتی دەکردیت لەبەر ئەوەی نەخاوەنی پێڵاوو نەخاوەنی پاڵتۆیت، گەر ئەوانەی لەگەڵت دان لەخۆت بچن، ئەوا تۆ هونەری هێنانی کلۆڵی فێر دەکەیت، سوکرات بۆ ئەو تاوانە وەڵام دەداتەوە کە ئازار ناکێشێ بەوەی کە بێ بەشە لەوەی نایەوێ و ئارەزووی ناکات ( قێزتان لەخواردنەکانم دەبێتەوە؟ ئایا کەمترین تەندروستی تێدایە وەك لەخواردنەکانتان، کەمترین خواردن کە زۆر دەگمەن و بەگرانترین نرخ دەست بکەوێ یان ئەو خواردنەی کە بۆ ئێوەی ئامادە دەکەن بۆ دەم خۆشترە لەو خواردنەی کە من دەیخۆم؟ نازانن کە لەگەڵ خواردنێکی خۆشدا پێویست بە بەهارات ناکات ئەوەی بەچێژێکی خۆش دەخواتەوە خەو بەو شەرابەوە نابینێ کە دەستی نایگاتێ، بەڵام دەربارەی جل و بەرگ ئێوە دەزانن کە ئێمە لەبەر ئەوەی دەیان گۆڕین بۆ ئەوەی بمانپارێزێ لەگەرماو سەرماو پێڵاو لەپێ دەکەن بۆ ئەوەی قاچمان لەکاتی رۆشتندا بریندار نەبن، ئایا ئێوە منتان بینیوە لەتاو سەرما لەماڵەوە خۆم هێشتبێتەوە، یان رۆژانی گەرما خۆم لەماڵەوە هێشتبێتەوە، ئایا ململانێی کەسم کردووە بۆ سێبەر،

دوا جار ئایا لەبەر برینی قاچەکانم لەخۆمم قەدەغە کردووە بۆ هەر شوێنێك بڕۆم کە خۆم بمەوێ؟، وەڵام دەداتەوە، گەر هەوڵ نەدات بۆ ئەو خۆشیانەی کە ئەنتیگون گێڕدەیەتی ئەوا هەست بەخۆشی لەوە خۆشتر دەکات، (بۆچی من کۆیلەی خواردنی خۆش‌و نوستن‌و ئارەزووەکان نیم؟ آه: لەبەرئەوەی خۆشی تر دەزانم، خۆشیان لەساتێکدا قەتیس نابێ، بەڵکو خۆشی یەکەی بەردەوامی دەبەخشێ، بەرای ئێوە ئاسوودەیی یەك دەردەکەوێ بەهیوای ڕێزێکی زۆری خەڵکان بۆ ئێمە، هەروەها باشترین هاوڕێی چاك؟ هیوایەکی سازگارە کە هەمیشەو پێ‌بەپێ‌یە لەگەڵ هەموو ساتێکی ژیانمدا، لەسەرو ئەوانەوە وەڵامە بەش بەشەکان بڵند دەبن کاتێك کە مالێمان زیاد بکات ئەوا پێداویستی یەکانمان کەم دەبنەوەو کاتێکیش پێداویستی یەکانمان کەم دەبنەوە ئەوا لەکەماڵی نزیك دەبینەوە، (خۆشی‌و نازناوەکان، ئا ئەمانە ئەوەن کە پێی دەڵێن بەختیاری؟ بەڵام من بڕوام وایە هەروەها ئەوە تایبەتیەکانی خودایە کە پێویستی بە هیچ نیە، بەهەندی ئەوەندەی پێداویستی یەکانمان لەخوداوەند نزیك دەبێتەوە؟ هەرواش هیچ شتێك لەخودا کەماڵتر نیە، ئەوەی زیاتر لێی نزیك بێتەوە ئەوا لەکەماڵ نزیك دەبێتەوە، ئەنتیستین لەسەر حەقە، (دەوڵەمەندی‌و هەژاری لەماڵەکانی دەوڵەمەندو هەژاراندا پەیدا نابن بەڵکو لەدەروونداا)ئەم گفت‌وگۆیە لەگەڵ (ئەوتیدیم)دا پەرە دەستێنێ (لەلێکۆڵینەوەی ئەم دەقەدا) (کێن ئەوانەی پێیان دەڵێن هەژاران‌و کێن ئەوانەی پێیان دەڵێن دەوڵەمەندەکان؟ ئەوانەی پێیان دەڵێم هەژار ئەوانەن کە خاوەنی شتێك نین کە هەموو پێداویستی یەکانیان جێبەجێ بکەن، دەوڵەمەندەکانیش ئەوانەن کە لەپێداویستی خۆیان زیاتریان هەیە، ئایا ئاگاداری ئەوەت کردووە کە هەندێ خەڵك

خاوەنی بەشێکی کەمن‌و دەتوانن خۆیان بژیەنن‌و هەندێکیش کۆبکەنەوە، بەلام ئەوانی تر سەرەڕای ئەوەی کە زۆریان هەیە بەلام خاوەنی پێداویستی یەکان نین؟ ئەمە وایەو راستە بۆ ئەو یادپێ کردنەوەیەم بۆی تۆ لەسەر راستییت، گەورەو بەڕێزی وا دەناسم کە دەست کورتی ناچاری کردوون تاوان بکەن، گەر مەسەلەکە بەو شێوەیە بێت ئەوا و پێویست دەکات ئەو گەورانە لەگەڵ گەلدا دانێین، بەلام ئەوانەی کە خاوەنی کەمن‌و دەزانن چۆن زگ هەڵگوشین بکەن ئەوانە لەگەڵ دەوڵەمەندەکان دادەنێین، ئەمە راستییەکی نەمرە، یەکەم کەس سوکرات بوو کە گوزارشتی لەوە کردووە، دواجار لەسەر زاری زۆربنەی مامۆستایانی ئاکاردا باسی لێوە کراوە، شوبنهاور دەڵێ بەختیاری‌و کلۆلی لەوەوە نایەت کە ئێمە خاوەندار بین‌و هەروەها چین لەم جیهانەدا: بەڵکو ئەوەیە کە خۆمانی تیا دەبینینەوە. بەجۆرێکی تر هەروەك چۆن دالامبرت دەڵێ لەو سۆزە بەتینەوەیە کە هەستی پێ دەکات، دالامبرت ئەو کەسەی کە (لەناخیدا هوشیاریەك هەبووە کە لەگەڵ دەروونتیدا پێك دەهات) کە ئارەزووەکانی لەگەڵ رەوشیدا رێك دەکەوێ، سوکرات هەموو پێك هاتەکانی ئەم شی کردنەوەیەی جیا نەکردەوە، بەلام گەوهەرەکەی خستە روو، ئەمەش چەقی فەلسەفە داهێنەرەکەی بوو، لەم بیروباوەڕەوە دوو ئەنجامگیری بەدەست دەهێنین،

یەکەم/ مۆرکێکی تیۆری‌و ئەوی دی پەیوەندی هەیە بەچاکە جۆراوجۆرەکانەوە، دوو گوزارشتی سوکاتیانە هەیە کە لەلای خوێنەرەکەی دەبینرێ‌و زۆر نامۆشن، گوزارشتی یەکەم ئەم رستەیە لەخۆ دەگرێ (هیچ کەسێك بە ئەنقەست خراپ نیە) خەڵکان سەریان سوڕما کە چۆن سوکرات توانی شتێك بکات کە بەشێوەیەکی روون پێچەوانەی دیاردەکان بێت، بەلام ئێمە لەوە دەترسین کە وەرگێڕان

سەرچاوەیەكی گران بێت، با بەشێوەیەكی پراكتیكیانە ئەم گوزارە ئەگریكی یە بەم رستەیە دەربڕین، (هیچ كەس بەئەنقەست رەفتاری خراپە ناكات)، یەكەو راست ئەوە دەبینین: كە جەخت كردنەوە ئاكامێكی تەواوی سروشتی بیروباوەڕەكانی سوكرات خۆیەتی لەراستیدا سوكرات وای دانا كە گەیشتن بۆ بەختیاری كردار باش دەكات كاتێكیش كردار بۆگەن دەبێ‌و نایەوێ پێویستی یەكەی تەواو بێت ئەو بەختیاری یە بەهەڵەدا دەچێ كە سروشتمان دەیەوێ، لەسەر ئەو رۆشنایی یە، بەو پێ‌یەی كە هەموو كەسێك بەهەموو هێزیەوە بەختیاری خۆی دەوێ‌و هەوڵی بۆ دەدات (هیچ كەسێك بە ئەنقەست خراپە دەكات) واتە (هیچ كەسێك بەئەنقەست بەختیاری خۆی وون ناكات) گوزارشتی سوكراتیانە شاز نیە، بەڵكو وەك راستی یەك دەردەكەوێ كە گفتوگۆ گەوار دەكات، گوزارشتی دووەم ئەم رستەیە دەگرێتە خۆ (چاكە زانستە) دەڵێن ئەمە نامۆیی یەكی ترە، بەڵام ئەم تاوانە ناحاڵی یەك بەدوای خۆیدا دەهێنێ لەتێ‌گەیشتنی سوكراتیانە بۆ گوزارشتی پێشوو، چ شتێك دەمانگەیەنێتە ئەو چاكە باڵایە بێ ئەوەی بگەینە بەختیاری؟. ئەویش نەزانینمانە، ئەمەش یان پێناسە راستەكەیەتی یان ئەو كەرەستەو رێگایانەن كە دەمانبات بۆ ئەوێ، كاتێك ئەو رێگایانە دەزانین كە دەبنە هۆی مولكدارێتی‌یەكەی ئەوا پێی دەگەین، ئەو مرۆڤەی خراپە دەكات لەچی كەمە، كەواتە ئەوە زانستی خێرو چاكەیە، چ شتێك ئەو مرۆڤە رزگار دەكات كە چاكە دەكات، ئەمەش خودی زانست خۆیەتی، دوایی چاكە بەشێوەیەكی كردارەكانی مل بۆ زانست كەچ دەكات، ئەمەش لای ئەو كەسە دەست دەكەوێ كە زانست بەدەست دەهێنێ، ئەوەش ئاكامێكی حەتمی یە، كسینوفون دەنوسێ: سوكرات ئەپستمۆلۆژی لەرەفتاری چاك جیا

دەكاتەوە ئەوەی خێرو چاكە بزانێو كاریان پێ بكات ئەوا زانایەكی بەهرەدارەو خۆشی لەشەڕ لادەدات، كاتێك سوكرات پرسیاری كرد ئایا ئەوانەی چاك دەزانن كە دەبێ چی بكەنو لەهەمان كاتدا پێچەوانەكەی دەكەن رۆشنبیرن؟ (ئەوانە نەزانن بەقەد ئەوەندەی گەندەڵن، سوكرات وەڵام دەداتەوە: لەبەرئەوەی بەباوەڕی من ئەوەی كە جیاوازی دەكات لەنێوان ئەو كردەوە ئەگەریانەی كە سوودێكی زۆریان هەیە ئەوا كاتێك كاری خراپە دەكەن دوو دڵ نابن لەهەڵبژاردنیدا (ئێمە نەزانین بەقەد ئەوەندەش تاوانبارین) لێرەدا سروشتی چاكەكاری دەردەكەوێ، یەكێك لەوانە هەموو لەخۆ دەگرێ؟ ئەمە حیكمەتە كە لەسەر زانینی پێناسەی تەواو بنیات دەنرێ بۆ بەختیاریو ئەو كەرەستانەی كە دەیانگەیەنێتە ئەوێ بەڵام بەدیاردەی جۆراوجۆر دەردەكەوێ، میانڕەوی ئەو چاكە كاریە بەرزەیەو گرنگترینیانەو لەراستیشدا لەهونەری رازی كردنی ئارەزووە شازەكانەوە سەر هەڵدەدات، زۆربەی خەڵكان قوربانی ئارەزووەكانیانن، هەركاتێك پاڵی پێوەنان تەواو بێ راوەستان لەئارەزوویەكەوە بۆ ئارەزوویەكی سەر ئێشەو شوومە دەڕۆن، بەپێچەوانەوە مرۆڤی میانڕەوگەورەی ئارەزووەكانیەتی رێكی دەخات، ئارامی دەكاتەوە، ئارامی دەكاتو میانڕەوێتی كامڵ رزگاری دەكات لەپێداویستییەكان، ناتوانرێ هەموویان بسڕینەوە بەڵام دەتوانرێت كەمێك هێور بكرێتەوە كەواتە میانڕەوی پێداویستی‌یەكی كەمە لەشتەكان، هونەری هەڵگرتنی خود لەتەرازووی دروستدا كە هیچ زیادەڕۆیی‌یەكی لێ نەبێتەوە، هونەری خۆسازدانی خود بۆ چێژ وەرگرتن لەو خۆشییانەی كە تێری پێداویستی‌یە حەقیقەتەكان بەرێگای ساكار بەدەستی دەهێنێ، بەلای ئەوەشدا ناچین كە تێگەیشتن لەمیانڕەوی جۆرێكە لەجۆرەكانی

وورگ هەڵگوشین، گەلێك بەپیتەو بەختیاری تێدایە (ئایا بیرت لەم مەسەلەیە کردۆتەوە؟ چ مەسەلەیەك؟ کە دەست بڵاوی ناتوانێ چێژمان پێ ببەخشێ لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئەوەیە کە تەنیا ئەو پێی دەوترێ، بەڵام میانڕەوی راسترین سەرچاوەیە بۆ خۆشی؟ چۆن؟ لەبەرئەوەی دەست بڵاوی‌و زۆر خواردن رێی دان بەخۆداگرتن‌و برسێتی‌و تینوێتیمان لێ دەگرێ، هەروەها رێگەنەدان بەچێژەکانی خۆشەویستی، بۆ ئەم هۆکارانە رێمان پێ نادات لەتاقی کردنەوەی سازگاری راستەقینە لەتێرکردنی داواکاریە پێویستییەکان، بۆچی چێژ لەتێرکردن‌و تینوێتی‌و ئارەزووی خواردن‌و خۆ بەدەستەوەدان بۆ خەوتن‌و شتەکانی خۆشەویستی وەردەگرین؟ لەبەرئەوەی بەهەموو توانایەکەوە ئامادەبووین بۆ بێبەش بوون لەو خۆشگوزەرانیە تەنیا میانڕەوی یە کە فێرمان دەکات چۆن بۆ داواکاریەکان دان بەخۆدا بگرین، هەروەها لەتواناشیدایە کە راستی چێژمان پێ بناسێنێ، سوکرات وەکو ئەو نمونەی توندی دەهێنایەوە خەڵکانی توشی سەرسوڕمان کرد، بەم چاکەکاریانە ژیاو خۆی لەبەردەم خەڵکاندا بەبەرزی راگرت، مەشقی بەدەن‌و هزری خۆی لەسەر سیستەمێك راهێنابوو کە ژیانێکی هەرزانی بەدواوە بوو لەنیگەرانی‌و لەمەترسی‌و لەپێویستی یەوە بۆ دەست بڵاویەکی زۆر، هەرچەندێکی هەبوایە هەمیشە بەشی پێداویستی یەکانی دەکرد. ئەو خواردنەی دەخوارد کە چێژی لێ وەردەگرت، حەزکردن نیازێکی بەهێزە بۆ خواردن چێژی لەهەموو خواردنەوەیەکی شەراب وەدەگرت لەبەرئەوەی تینوێتی پێ دەشکاند، کاتێکیش بانگ هێشت دەکرا بۆ خوانێك ئەوا زۆرە خۆری نەدەکرد وەك ئەوانی تر، گوێڕایەڵی ئەوانی تری دەکرد بۆ ئەوەی کە تێر بوون ئیتر دەست درێژنەکەن بۆ خواردنە بەتاماکانی تر، هەروەها

ئامۆژگاری دەكردن كە تێر دەبن لەشەراب خواردنەوە دەست درێژ نەكەن بۆ شەرابە رازاوەكان، هەروەها دەیوت كە زۆر خواردن خراپە بۆ گەدەو سەرو هزر، بەو خواردنە دەسمانە (سیدسی) خەڵكانی دەكردە بەراز، ئازایەتیش لەمیانڕەوی كەمتر نیە: (ئایا ئازایەتی دەخەنە ریزی شتە جوانەكانەوە؟ ـ بەڵێ ـ لەنێو جوانەكاندا ـ كەواتە ئێوە وای بۆ دەچن كە سوودی نیە بۆ مەسەلە بچووكەكان؟ وابزانم لەوە گەورەتریش بەسوودە بۆی! لەراستیدا بەهۆی چاكەی ئازایەتیەوەخودمان تێك دەشكێنین‌و ژیانمان رێك دەخەین، پێویستمان بەئازایەتی یە بۆ ململانێ كردنی ئارەزووەكانمان‌و بەدەست هێنانی ئەو میانڕەویەی كە خۆمان بەهاكەی دەزانین چەندە، هەروەها كاتێك مەترسیەكان هەڕەشەمان لێ دەكەن پێویستمان بەئازایەتی هەیە، كاتێك كە هەڕەشەكە گەورە دەبێ، هەندێ خەڵكان بەشێوەیەكی دڵسافی رووبەڕووی مەترسی یەكان دەبنەوە بێ ئەوەی دەرك بەدەرەكیەكانی بكەن، ئەمەش رەفتارەش لەئازایەتی یەوە نیە، دەبێ ئەوە بزانین لەئازایەتیدا چیمان رووبەڕوو دەبێتەوەو چی هەڕەشەمان لێ دەكات بەشێوەیەك‌و بەبیرێكی روون رەفتار بكەین، ئازایەتی لەنێوەندی مەترسی یەكان‌و لەنێو شتە ترسناكەكاندا جێبەجێ دەكەین، بەڵام وا باشتر نیە كە خۆمان لەو شتە مەترسیانە دوور خەینەوە؟، بەپێچەوانەوە دەبێت بیانناسین‌و بیانناسین ـ ئەوانەی هەڵ دەكوتنە سەر مەترسیەكان لەبەرئەوەی شارەزانین لێی كە وابێ ئازانین؟ بەهەموو پێ داگرتنێكەوە نەخێر، سەپاندنی ئازایەتی راستەقینە زانستە كە پێویستە جێبەجێ كەیت (بۆ رەفتار كردن چاكە) لەمەترسی یەكی سنورداری هەمەلایەنە، (ئەوانەی دەتوانن سوود لەبارودۆخی مەترسی‌و ترسناك وەرگرن من وای بۆ دەچم كە ئەوانە خەڵكانێكی ئازا بن، بەڵام

بێ دەسەڵاتەكان ئەوە نازانن؟ ئەو خۆڕاگریە چییە كە بەزانینی مەترسیو بێ ئاگایی یە رۆشنە، تەنها ئازاییو خودی حەقیقەتە كە دوورە لەترسنۆكیو هێزی یەكسانییەوە، سوكرات بەزۆر مەسەلەكە دەباتەوە سەر لێكۆڵینەوەی ئەو راستیانەی كە ماندوو بوون پڕ بەپێستی خۆی دەبێت لەكاتی خۆیدا بەڵام ئەركی كاركردنو بەهاكەیەتی، كۆیلایەتی لەو سەردەمەدا پەرەی سەندبوو، خەڵكانی ئازاد نەدەسڵەمنەوە لەوەی كە كار كۆیلایەتیو دوور بینی بێ، سوكرات دژی ئەو دیاردەیە بەتەمبەڵی لێك دەداتەوە، (ئەگەر سەیری ئەو كەسانە بكەن كە ئازادن، كێیان زیاتر لای ئێوە بەختیار دێتە پێش چاوتان، ئایا ئەوانەن كە خۆیان دەدەن بەدەست بێ ئیشی یەوە، یان ئەوانەی كە بایەخ بەشتەكان دەدەنو سوودمەندنو دەیزانن؟ ئایا تەمبەڵیو بێ ئیشی یاربدەدەرە بۆ بەدەست هێنانی ئەوەی كە دەتەوێت فێرببیت یان بۆ یادكردنەوەی زانیاریەكان یان بۆ پارێزگاری كردنی تەندروستی یان بۆ بەهێز كردنی بەدەن یان بۆ بەدەست هێنانی خۆش گوزەرانیو درێژەپێدانی، بەڵام كاروچالاكی بۆ هیچ شتێك بەكار نایەت، سوكرات یاریە وەرزشیەكان بەتایبەتی مەشقی سەربازی بەپلەی یەكەم دادەنێ لەو كارانەی كە گرنگی پێ دەدرێ، مەشقە سەربازیەكان بەكۆمەڵی دەكرێن، بەڵام ئەم مۆركە پاساو نیە بۆ بایەخ نەدانی لەلایەن تایبەتەوە، ئێوە باش سەیركەن كە لە چ ململانێ یەكدانو لە چ پێشنیارێكدان، پەشیمان نین لەبەرئەوەی مەشقتان بەهێزتان كردووە، لەهەموو كردەوەیەكدا سوود لەجوانی بەدەنو رێكی دروست كردنیەوە وەردەگرین، تا وای بۆ دەچن كە بەدەن بەشێكی كەمتری پێ دەدرێ، هەروەك حاڵی كردەوەكانی ئیدراك، كێیە ئەو كەسەی كە نازانێ چەند هەڵە دەكات لەبەر ئەوەی مەشقی

بەدەنی نەکردووە. بەهەموو راستییەکەوە دەڵێم کە ئەم فێرکردنانە نابنە سیستەم، نابێ لەوە زیاتر خۆمان لەپەیوەندی یە لۆژیکییەی کە بەڕوونی ئەو تیۆرە جیاوازیانەی کە کورتمان کردوونەتەوە گێل بکەین، لێرەدا ئەو گفتوگۆیانەی کسینوفون ئاسان ناکەینەوە لەبەرئەوەی هەندێ توخمی تیایە کە جیاوازیەکی کەمی تیادایە کە بابەتەکە لاواز دەکات یان کەم بەلایدا دەچێت. دوای ئەوەی ئاگاداری ئەو وردبینیە بووین کە پێشتر دیاریمان کرد لەشی کردنەوەکاندا سەرمان دەسوڕمێ لەهەندێ تێبینی نا بەجێ دەربارەی چاکە جیاوازیەکان کە سیمای ئاسایی سوکراتیانەی بەشێوەیەکی بەهێز پێوە دیار بوو بەرەو بەختیاری‌و بەئیرادەیەکی بەهێزەوە، هەندێ جار دەبینین هۆ دۆزەکان دەبنە هۆی دابەزینی بەهاکەی لێرەشەوە ئازار دەچێژین ئایا لەبەر ئەوە بوو کە (هومیرس)ی دڵپاك لەهەندێ کاتدا سەهو دەکات؟، ئایا لەبەرئەوە بوو کە کسینوفون بەهەڵە تێگەیشتووە یان بەهەڵە گوێزراوەتەوە؟ ئایا سوکرات ئاستی خۆی لەئاستی بیروڕای گفتوگۆکاران‌و سۆزبان دادەنێ؟ هۆی کەی چەندو چۆن بێت، گەر باوەڕیش بەکسینوفون بکەین سوکرات ڕێگری ئەو سوکایەتیانەی نەدەکرد کاتێ مرۆڤ دادپەروەر دەبێ دەتوانێ بەرگری لەخۆی بکات بەرامبەر هەر کەسێکی هێرش بەر، کاتێك مرۆڤ چاك دەبێت یان کەریم دەبێت هاوڕێ ڕادەکێشێ بۆ لای خۆی. ئەم ڕەفتارە سوکراتیانەیە خەم‌و پەژارەمان دەداتێ، چۆن ئازار نەکێشین کاتێك دەربارەی هاوڕێیەتی شت دەخوێنینەوە، (یان ئەوەتا هاوڕێیەکی چاك هەڵبژێرین لەبری هەموو خێرێك؟ ئایا سوود لەئەسپێك یان دوو سوار چاك دەبینین؟ هیچ شتێك لەو خزمەتە بایەخدار تر نیە کەقاچەکانمان پێشکەشمان دەکەن، یان هەردوو دەستمان یان هەردوو چاومان

یان هەردوو گوێمان كە لەسەرو توانای هاوڕێیەكی بەسۆزەوە نیە، ئەو كارەی كە پێی هەستام بۆ سوودی تایبەتی تۆ گەر گوێ پێ نەدەیتو پێی نەزانیت ئەوا هاوڕێكەت گوێی لێ دەگرێو جێگات دەگرێتەوە بەمە دار دەڕوێنیت بۆ ئەوەی بەرهەمت بۆ بەدەست بهێنێو دوا جار وازی لێ دەهێنیت، جوانترین بێستان كە بەرهەم بێت بێستانی هاوڕێیەتییە، شتی باشترمان چاوەڕێ دەكرد لەسوكرات، دوایی با دوو تیۆر بخەینە بەر باس كە لە (گفتوگۆ نەستەقەكان)دا هاتووە كە هەردووكیان زۆر گرنگن بەڵام بێ ئەوەی كسینوفون ئەو پەیوەندیەمان بۆ ڕوون بكاتەوە لەگەڵ ئەوەی كە پێشوتر وتویەتی، یەكێكیان پەیوەندی هەیە بەدادپەروەریو ئەوی تریش پەیوەندی هەیە بەدینەوە، دادپەروەری چییە؟ سوكرات پاڵپشت بەتێگەیشتنی یاسایی یەوە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە بەڵام بەئاڵۆزی ئاماژەی پێ دەدات، سەرەتا یاسا ئەوەیە كە یاسای بەشەرەو لەهەموو شارو هەموو دەوڵەتێكدا دانراوە، دادپەروەری ئەو كارە وردەیە كە بەپێی یاسا دەچێت بەڕێوە، بەپێی مانای یەكەمی فۆنەتیكەكەی (كەواتە دەڵێم دادپەروەری كار كردنە بەپێی یاسا، كەواتە ئەوەی هاوشێوە بێت لەگەڵ یاسادا پێی دەڵێن دادپەروەری؟، بەڵێ - بەڵام زۆر بەباشی لەوە تێ ناگەم كامە هاوشێوەی یاساو كامەیە ناوی دەنێی دادپەروەری! ئایا یاساكانی دەوڵەت دەزانیت؟ - بەڵێ - چین؟ بەپێی پەیمانێكی گشتی ئەو فەرمانەیە كە هاوڵاتیان فەرمانیان پێدا یان نەهیان لێ كرد، - باشە! ئایا ئەو هاوڵاتیانەی ئەو فەرمانانە جێبەجێ دەكەن هاوڕێی یاساكانن؟ ئەوەشی یاخی بێ لێی دوژمنیەتی؟ ئەمە زۆر ڕاستە! ئەوەی مل كەچی یاساكانە دادپەروەری دەپارێزێ، بێ گومان ئەوەشی لەیاساكان لادەدات بەستەم لێكراو دەبێتە

تاوانبار) بەلاَم دادپەروەری لەو چەمكەدا قەتیس ناكریَ لەگەلَ ئەو یاسایانەی (نوسراوەتەوە) لەڕاستیدا یاسای تر هەن كە (نەنوسراونەتەوە) لەهەموو جێگایەك دەیبینین‌و مۆركی شوێنێكی پێوە نییە، كە سەر بەرِەچەی بەشەر نیە بەلكو خودایی یانەیە (ئەی ئیبیاس ئایا دەزانیت كەیاساكان نەنوسراونەتەوە؟ بێ‌گومان لەناو هەموو ولاَتێكدا بلاَوبۆتەوە ـ یان دەلێیت كە بەشەر داینـاوە؟ چۆن دەتوانی وا بلێیت سەرەڕای ئەوەی كە نەیانتوانیوە هەمووی لەیەك شوێندا كۆبكەنەوە، لەلایەكی ترەوە بەیەك جۆرە زمان نادوێن، كە وابێ بەلای تۆوە كێ ئەم یاسایانەی داناوە؟ خوداوەندەكان بۆ بەشەریان داناوە، سەرەتای ئەو یاسایانە كە باوەڕپێكراوە لەلایەن جیهانەوە فەرمان دەدات كە ڕێز لەخوداوەند بگیرێ، دوایی ئایا ئێمە ئەوەشی تیا نادۆزینەوە كە وەسیەتی ڕێزگرتنی كەس‌وكاری تیادایە؟ بێ‌گومان ئەم یاسایانە هەمان ئەو یاسایانەن كە زەماوەندی دایك‌و باوك قەدەغە دەكات لەكوڕو كچەكانیان، ئەو كاتەش كە پێویست بوو ئەوا فەرمان دەدرێ بەمندالەكان ژن بهێنن؟ سوكرات مەسەلەكە پوخت دەكاتەوە (ئەوە كێیە فەرمانی دادپەروەری دەدات، ئەگەر خواوەند نەبێ؟ ئەو شتەی كە خواوەند رازی دەكات، كەواتە ئەیبیاس ئەوە دادپەروەرییە، لەهەمان كاتدا وێك چوونە لەگەلَ یاساكاندا، سوكرات بەشێوەیەكی گەش بین‌و وورد بەكسینوفون رادەگەیەنێ، ئەوەی یاساكان دەناسێ دەزانێ چی پێویستە بیكات، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی مل كەچی یاساكان بێت وەك پێویست، لەنێو ئەو كەسانەی كە ئەركەكانیان دەزانن ئایا كەسێك هەیە بتوانێ لێبوردنی هەبێ؟ ئەمەش مەحالە! ـ كەسانێك دەناسیت كە پێچەوانەی ئەركەكانیان بن لەناو خەلكاندا، بێ‌شك بەدوای دادپەروەری دەگەڕێین؟ بەهۆی بەدواداچونمان بۆ

دادپەروەری ئایا ئێمە دادپەروەرین؟ ئایا دەتوانین بەفۆرمێکی تر دایرێژین؟ کە وابێ دادپەروەرناس دەناسینو پێی ئاشنایینو یاساکان دەناسێ بۆ مامەڵە کردنی لەگەڵ خەڵکیدا؟ وا دێنە پێش چاوم بەو شێوەیە پێناسەی بکرێو بناسرێ، هەندێ دارێژراو هەن کە لەلایەن حیکمەتە بەرژەوەندی یەکانەوە دادەرێژرێ، پێویستە حسابێك بۆ ئەمە بکەین ـ ئەوەی سەرپێچی لەو یاسا نوسراوە خوداوەندیانە بکات یەکەو بارگری سزای تاوانەکەی خۆی وەردەگرێ، ئەوانەی سەرپێچی لەیاساکانی خوداوەند دەکەن ئەوانە سزایەکی دادپەروەرانە دادەبەزێ بۆیان بەڵام خەڵکانی تر هەن کە سەرپێچی یاساکانی بەشەر دەکەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سزایە نادرێن، نمونەیەك دەهێنێتەوە بەوەی کە کەسێك رێ بدات بۆ ژن هێنان لەخزم بۆ ئەوەی نەوەکەی کەمو کوڕ نەبێ لەڕووی بەدەنیو عەقڵو ڕەوشتەوە، چۆن پێ نەزانینی چاکە دەبێتە هۆی لەدەست دانی هاورێ. بەڕاستی سوکرات لێرەدا دادپەروەری خوداوەند دەبینین، ئایا ئەو کەسەی یاسای دانابێ بەرزتر نیە لەمرۆڤ کە هەر یاسایەکە لەخۆیدا سزای سەرپێچی کەری هەڵگرتبێ؟ یان ئەوەی سەرپێچی یاساکانی بەشەریەت دەکات راستگۆیی خەڵکان دەدۆڕێنێ، خودی خۆی لەشار دوور دەخاتەوە، یەکسەر لەتوخمو گەوهەری بەهای ژیانی دەدۆڕێنێ، ئەمە هەمان ئەو تیۆرانەن کە ئەفلاتۆن لە (کریتون)دا ئاماژەی بۆ کردووەو دیاری دەکات، ئەمە تروسکاییو سەرکەوتنی بیروباوەڕی سوکراتە، دانایی یەکەی بانگهێشت کردنە بۆ باوەڕبوون بەبوونی خوداوەندەکانو ڕێزگرتن بۆ ئایین پەروەریەکەی. چۆن بوونی خودا رەت دەکرێتەوە، ئەمەش کاتێك مەبەستدارێتی لەهەموو شتێکدا دەبینین؟ کێ خاوەندارێتی چاومان بۆ شی دەکاتەوە کە دروست کراوە بۆ بینین، هەروەها دوو

دەست بۆ شت گرتن، هەروەها قاچیش بۆ رۆیشتن بێ گەڕانەوە بۆ ئاوەزێکی ڕێکخراو؟ ئایا ئەوەش جوان نیە کە سروشت ئاویشی تیادایە بۆ شکاندنی تینوێتیمان، داریش بۆ ئەوەی بەرهەمی میوەمان بداتێ؟ هەرچۆنێك بڕوانین شەێنەواری ئارەزوو چاکسازی خوداوەندیانە دەبینین زەوی پڕ بوو لەدیاری قشەنگ‌و جوان بۆ گەشانەوەی خەڵك کەواتە با بەو خێرە زۆرو بە بەرەکەتە بزانین کە خوداوەند خۆشەویستی کردووە لامان‌و با بەپاڕانەوە راوەستین لەبەردەمیدا، گەر زانیمان سروتی وڵاتەکەمان بەڕێوە دەچێ‌و چۆن بەپێی نەریت‌و قوربانیەکان پێشکەش دەکرێن ئەوا نزاکان بەدەست دەهێنین، ئەوانەش هەمووی بە (دڵێکی پاکژو بێ گەرد) دەچێت بەڕێوە، تەنها داوا لەخوداوەند بکەین (ئەوەی باشە بۆ ئێمە) پێمان ببەخشێ، لەبەر ئەوەی نایانزانین بەڵکو ئەو باشتر لەئێمە شارەزاترە، دەربارەی ئەو شتانە دەدوا، کسینوفون دەڵێ هەر وەك چۆن (بیتی) وەڵامی ئەوانەی پرسیاریان دەربارەی ئەو قوربانیانەی دەیان‌ویست پێشکەشی بکەن‌و ئەو خێرانەی دەبوایە بۆ رۆحی مردوان بکرایەو هەموو کاروکردەوەکانی دین دەدایەوە، قەشەکەش بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە کە بەهەمان شێوە تەقوای خۆتان دیاری دەکەن لەبەردەم خوداوەندا، ئائەوانەیە کە سوکرات دەی کردو بەوانیشی رادەگەیاند، ئەوەشی پێچەوانەی ئەو زانیاریانە بجولایەتەوە ئەوا بەگێل‌و گەمژەی دادەنا، نزاو پاڕانەوەکانی ساکار بوو، لەخودا دەپاڕایەوە کە ئەوەی چاکە بووایە پێ‌ی بدایە، بەو قەناعەتەی کە خواوەند خۆی چاك بەرژەوەندی یە چاکەکانمان دەزانێ، ئەمە ئەو تۆخمە گرنگانەن لەوانەکانی فەلسەفەی سوکراتیدا، لێرەدا بەپێ‌ی باوەڕی کسینوفون‌و بەپێ‌ی گوزارەی (امیل بوترو) بەیەکێ لەدامەزرێنەری ئاکار دادەنرێ،

ئاكاریش داواكاریەكی شازە بۆ بەختیاری، فێربوون كە چۆن بـەختیاری سـەر زەوی بەدەست بهێنین كە سروشتمان تێی دەچێ بەو پێیەی كە خوداوەند پۆلێنی كردین، بـۆ گەیشـتن بـە بـەختیاری پێویسـتە سـازكاری بكـەین لـەنێوان ئارەزووەكانمـانو رەوشتماندا، بەشێوەیەكی رێكو پێك بەدەستی دەهێنین ئەمـەش بەجێبەجێكردنی ئـەو دادپـەروەریو تەقوایـەی كـە بڕواداره‌كـان هەیانـە لـەپێناو چاكسـازی خوداوەندەكاندا.

٣- ئەوە دەمێنێتەوە بڵێین كە سوكراتی راستی سوكراتی كسینوفون بـووە، كەواتـە گـەڕانو پشـكنین بەدوایدا ئـەوا لەپەیڤـەكانی ئـەفلاتۆنی سـوكراتیدا ئـەوە خاڵـە كرۆكانـە دەدۆزینـەوە كـە سـازكاریەكی تـەواویان هەیـە لـەنێوان هـەردوو دیكۆمێنتەكانـدا، یەكـەمیان پـەیڕەوی خـودی ئـەو پەیڤانەیـە وەك (سـوكراتی ئەفلاتۆن)و (سوكراتی كسینوفون)دا هەیەو پێویستی بەقسە كردن هەیە، بەهەمان شێوە رێگای پرسیارو وەڵام ئەگرێتـە بـەر بـەڵام خـۆی لەپەیڤـە درێـژەكان نـادات، لەسەرەتادا بەیەكسانی بەرامبەرەكەی رادەكێشێو وای لـێ دەكات كە هەموو شتێ دەزانێ تا وای لـێ دەكات لەنەزانینی خۆی ئاگادار بێ، ئەمـەش بـەپێی جیـاوازی پێناسەی سەپێنراو لەگەڵ نمونەدا دەیگەیەنێتە ئەو حاڵەتە، لەبەرامبەر ئەوەشدا یان دەرئەنجامی راست دەدۆزینـەوە یـان بەرهـەمی گـەورە دەدات بەدەسـتەوە كـە وابـێ تابلۆی كسینوفون دەربارەی (مایوتیـك) لەگـەڵ تـابلۆی ئەفلاتۆنـدا وێـك دەچـێ، هـەروەها هاوپـەیمانی ئـەو وێـك چـونانەی زوربـەی ئـەو كێشـانەی كـە سـوكرات دەیسەلمێنێ دێتـە بـەر چـاومان، لای ئـەفلاتۆن ڤێـوەزنی سـوكرات بـەدی دەكـەین بەرامبەر لێكۆڵەرەوانی فەلەكو زانایـانی فیزیـا ئەوانـەی وا دەزانـن كـە دەربـارەی

هەموو شتێ بكۆڵنەوە، ئەوەی كە سوكرات دەیزانی ئەوەیە كە هیچ نازانێ، فالێچیەكەی (دلف) جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە هیچ مرۆڤێك لەسوكرات ژیرتر نیە، بەمەش سوكرات پرسیار لەهەموو كەسێك دەكات بۆ ئەوەی بزانێ كە فالێچیەكەی (دلف) زیادەڕۆیی نەكردووە، ئەمەش پالی پێوە دەنێ بۆ لێكۆڵینەوەیەكی سەخت بۆ ئەنجامگیری ئەمەی خوارەوە، زانایانی ئەپستمۆلۆژی بانگەشەی ئەوە دەكەن كە بەڕاستی لەسوكرات زیاتر دەزانن، بەڵكو ئەوان زانیاریان كەمو كەمتر دەزانن، سوكرات خۆی دەزانێ كەوا هیچ شتێ نازانێ، ئەوانیش هیچ شتێ نازانن، تەنانەت واری نەزانینیشیان نازانن، نەزانین زیان بەخش نیە، بەڵكو ئەو نەزانینە زیان بەخشە كە خۆی بەزانا دەزانێو بڕیار دەردەكات، لەپەیڤەكاندا ئەو دڵڕەقی یە دەردەكەوێ بەرامبەر بیروباوەڕی سەفسەتائیەكانو ئەو دەرئەنجامەش كە بەدەستی دەهێنین، ئەوانەی كە كرێ وەردەگرن بەرامبەر ئەو زانیاریانەی دەیدەن چۆن دەوێرنو چۆن دەتوانن هەستەكانو زانست تێكەڵاو بكەن، ناڕەزایی ئەو قسەیەش دەردەبڕن كە بۆقیش وەك مرۆڤ هەموو شتێ دەزانێ، نەخۆشیش نەخۆشییەكەی خۆی دەزانێ نەك پزیشك؟ چۆن بەربەست لەبەردەم ناڕەزایدا قوت دەكرێتەوە كاتێك جەخت لەسەر تاكە زانیاری بەسوود دەكەنەوە ئەویش وەرگرتنی زانستی ڕەونبێژی یە. بەڵام ئێمە دەزانین گەر گوتەبێژی خزمەتی ڕاستیو جوانیو خێر نەكات بایەخی نابێ؟ هەمان قسەش دەربارەی (كەئیبیاس)ی سەفسەتەچی كە بەرامبەر پێناسەیەكی هزری گشتی بێ دەسەلاتە؟، ریزكردنی نمونە هێنانەوە دەربارەی شتە جوانەكان نامانگەیەنێتە زانستی سەرچاوەی جوانی، هەروەها لای سوكراتی ئەفلاتۆنی ئەو گوزارە گەوهەریانە بەدی دەكەین كە بەشی ئەرێی لەو

فەلسەیە خراوەتە پاڵی ئەمەش لای کسینوفون بەدی دەکەین، (کەئیبیاس)ی بچوك وا ئامادە کراوە کە بەرێگایەکی ناڕاستەوخۆ بمانهێنێتە سەر رێگا کە (هیچ کەسێك بە ئەنقەست خراپە ناکات) بەڵام ریشەی (ئەلسیبیاد) بابەتێکە بۆ گفتوگۆ، سوکراتی تیا دووبارە دەبێتەوە، بەهەر حاڵ، چاکە زانستە، ئەوەی دەزانێ خێرو کەرەستەکانی گەیشتن بەخێر چی یە ئەوا هەرچۆنێك ئارەزووی بێت کاری پێ دەکات، خراپەش تەنها بەرهەمی هەڵەو گێلییە، تەنیا رێگا بۆ ناسینی چاکە بەپێی گوێڕایەڵی (هەیکەلی دلف) فێربوونە بۆ ناسینی خودی خۆتە بۆ خود، ئەوە (کریتون)ە کە مۆرکی پیرۆزی کردە بەر یاساکانو منداڵیمانی گۆش کردو ژیانمانی پاراست، دەشێ مل کەچی بین بۆ ئەوەی دادپەروەر بین، رقمان لەخۆمان نەبێتەوە، ئەمەش ئەوپەڕی بێزاری یە لەژیاندا، ئەوەش (اوتیفرون)ە کە بەربەرەکانی دیانەتی گوازراوە دەکات بۆ کۆمەڵێك جوڵەی پەرستنو دیانەتی راستەقینە، فەرمان دەدات بەدڵێکی پاك نەبێ بەرەو رووی خوداوەند نەچین، دەربارەی هەموو ئەو خاڵانە پەیڤەکانی کسینوفونو گفتوگۆ سوکراتیەکانی ئەفلاتۆن وێك دەچن، ئەو سادە ووردبینە دەمێنێتەوە کە ئەفلاتۆن تیایدا لە (سوکراتیەت) دەوەستێو بە (ئەفلاتۆنیەت) دەست پێ دەکات، ئێمە ئەو پرسیارە تایبەتیانە ناکەین کە دوایین گفتوگۆکانی ئەفلاتۆنن، لەبەرئەوەی سوکرات بەشێوەیەکی شکلی‌یە سەرەڕای ئەوەش ئەوەی نوسینەکانی قۆناغی پێگەیشتنن ئەوە دەخوێنێتەوە ناچار دەبێو بەوە رازی دەبێ، با دوو فۆرم دەربارەی ئەوە باس بکەین، یەکەم لە (مینون)ەوە دەست پێ بکەین، بێ شك گومانمان نیە لەوەی کە ئەو گفتوگۆیە پەیوەندی بەبیروباوەڕی سوکراتیەتەوە نەبێ، هیچ دەلالەتێك نیە بۆ ئەو کێشەیە باشتر لەو تاقی

كردنەوەیەی كە بەسەر كۆیلەیەكدا دەكرێ، تەنیا ئەو پرسیارە بەسە كە بەشێوەیەكی ڕێكوپێك لێی بكرێ بۆ ئەوەی لەخۆوە چارەسەری ووردی كێشەیەكی ئەندازەییمان بۆ بدۆزێتەوە، وێنەیەكی چوارگۆشە كە ڕووبەرەكەی دوو ئەوەندەی ڕووبەری ئەو چوارگۆشەیە بێ كە دراوە ئەمەش پراكتیكێكی جوانو قەشەنگی (مایوتیك)یانەیە بەلاّم لەپڕ ئەفلاتۆن لەسوكرات لادەدات، مامان ناتوانێ مامانی ژنێك بكات كە خۆی سك پڕ نەبێ، بەو پێیەش بیرمەند ناتوانێ خاوەنی گفتوگۆ بێ بۆ دۆزینەوەی ڕاستیەكان گەر خۆی هەڵگری ئەو بیرە نەبێ، دەرئەنجامەكەشی ئەوەیە (زانست تەنهاو تەنها بیر خستنەوەیە) ئەمەش بەو شێوەیە ناگونجێ تەنها لەرێی ئەم خاڵانەوە نەبێ:

١ـ هەموو كەسێك لەژیانی پێشودا بەدەستی هێنا بێت.

٢ـ هەموو كەسێك هەر لەمنداڵیەوە خزمایەتی هەیە: ئەم گوزارشتانە دەبێتە هۆی بۆچوونی قوڵ لەمیتافیزیكی ئەفلاتۆنیدا، ئایا سوكرات ئەو بەڵگانەی وێنا دەكرد؟ كە هیچ گومانی تیادا نەبێت، هەروەها گومانیش لەوە نیە بەرامبەر پارچەیەكی تر لە (مینون) خۆی. لەراستیدا وا دەردەكەوێ كە ئەفلاتۆن لەسوكرات جیا دەكرێتەوە، ئایا ڕاستە (فەزیلەت ـ چاكە) زانستە، بەجۆرێكی تر دەبێ زانست هەبێ بۆ ئەوەی مرۆڤ چاكە خوازبێت، ئایا ئەمە بەسە؟ گەر مەسەلەكە بەو شێوەیە بێت چاكەخوازی بەوە دەست دەكەوێ كە باوك كوڕی خۆی فێر بكات، ئەم حاڵەتەش ئەوەیە چەند لەباوكانی (چاكەخواز) سەرەڕای هەوڵو كۆششیان نەیانتوانی هەستو زەوقی چاكەخوازی بگەیەننە كوڕەكانیان! كە وابێ شتێكی سەرەكی تر هەیە لەبنەمای چاكەدا، شێوەیەك لەهەستێكی ڕاستەوخۆ، ڕەمەكی فاڵچیێتی، ئایا ئەم

فێركردنە سوكراتیانەیە؟ پرسیارێكی ووردە، لەبەر ئەوەی كە سوكرات بانگەشەی ئەوە بكات كە (چاكەخوازی ـ چاكەكاری) كارێكی زانستە ئەوا هەمیشە بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە خاوەنی (جنۆكە) بووە واتە جنۆكەی هەبووە، كە لەكاتی كاری خراپە كردن هەمیشە ئاگاداری دەكردەوە، بەڵام نزیك بوونەوەیەك دەدۆزینەوە لەنێوان ئەو جنۆكەیەداو ئەو هەستە راستەوخۆیەدا كە ئەفلاتۆن باسی لێوە دەكات، كێ ئەو سنوورە وردە لەنێوان سوكراتیەت‌و ئەفلاتۆنیەتدا وێنە دەكات، زەحمەتێكی هاوشێوە دەبینین دەربارەی (فیدون)و زۆر ئەگەری ئەوە هەیە كە پێ دەچێ سوكرات رەزامەندی هەبووبێ بەرامبەر بەردەوامی (نەفس) دوای مردن، بەرگریەكەی سوكرات ئەم پرسیارە دەهێنێتە ئاراوە: یان ئەوەتا مردن فەنای هەموو هوشیاریی‌و ئارامیەكی رەهایە دوای ئەوەش ئەمە چاكەیەكە كە هیچ شتێكی ناگاتێ. یان ئەوەتا نەفسەكان دەڕۆن بۆ ئەو شوێنەی نەفسی وەچەكان كۆدەبنەوە لێی وەك نەفسی هومیروس‌و هینریودو نەفسی پیاوە بلیمەتەكان، گەر ئەوە ئاهەنگێ بێ‌و مردن بۆمانی دانێ ئەوا بوارێك هەیە بۆ زاڵ بوون بەسەر ترس لەمردن، با وای بۆ بچین گەر یەقین نەبێ ئەوا بڕوا بوون بەنەمری لە (تكایەكی جوان) كەمتر نیە، بەم پێیە ئەم چەمكانە بەشێوەیەكی راست ئەوا چەمكێكی سوكراتیانەن، بەڵام ئایا وا پێویستە لەسەرمان كە سوكرات ئەو بەڵگانەی دەرك پێ‌كردووە هەروەك چۆن لە (فیدون)دا هاتووە، وەك نكوڵی كردنی گەندەڵی لەلایەن نەفسەوە لەبەرئەوەی بنەمای ژیانەو مردن تێی ناكەوێ كە دژبەتی، ئەمەش وەك سەلماندنی بەڵگەی هەر دژێك لەدژەوە دێت دەردەكەوێ، وا پێویست دەكات كە ژیان لەمردنەوە بێت هەروەك چۆن مردن لەژیانەوە دێت؟ ئەمەش ئەو تیۆرەیە كە

پالْپشته بەو تیۆرە یادخستنەوەیەی لە (میون)دا هاتووە؟ ئەمەش ئەگەرێكی زۆر لاوازە كە سوكرات بكەوێتە نێو ئەو بەڵگە وردە سەختەوە، لەوانەیە ئەفلاتۆن بیرۆكەی یەكەمی لە (فیدون)ەوە و لەفێربوونی سوكراتیەوە وەرگرتبێ، ئەو بەڵگانەش كە پێشكەشی دەكات لەوانەیە لەسەرچاوەیەكی ترەوە وەری گرتبێ، دەتوانین شێوەی ئەو نمونانە بهێنینەوە ئەوەی پێشكەشمان كرد بۆ سەلماندنی كە مەحاڵە بەووردی ئەو جیاوازكاریە روون بكەینەوە كە لەنێوان ئەفلاتۆن‌و سوكراتدا هەیە، ئەمەش دوای ئەوەی بەدویدا دەچوو یان لە چ شوێنێكدا دژی بوو.

٤ـ ئەم وردەكاریانە هەرچۆنێك بێت ئەوە دەبینین كە فێركردنی سوكراتیانە شێوەیەكی روونی گشتگیری دەگرێتە خۆ لەهێڵە سەرەكیەكاندا. هەندێ لەبیرمەندان وایان دانا كە سوكرات وەچەی مەسیحیەت بێت، سوكرات فۆرمێكی خودی ئەومرۆڤەیە كە هەمیشە فەلسەفەی بت پەرستی بۆ ترۆپك بەرزی كردەوە، بەمانای وشەی بەهێز سوكرات حەكیمە، حەكیم: لەرووی عەقڵەوە واتە هەوڵ نادات خۆی بخاتە وەهمەوەو خۆشگوزەرانی بداتە ئەوانی تر بەڵكو بەشێوەیەكی خاكیانەو بەووردی جیاكاری دەكات لەوەی كە دەیزانێ‌و ئەوەشی نایزانێ‌و ئەوەشی كە هەمیشە نایزانێ، دوهەم حەكیم دەبێ لەرێی پراكتیكەوە توانای مرۆڤ دەرك پێ بكات‌و ئەو داواكاریەشی كە لەبوون داوای دەكات، ئەمەشی كردە نمونەو دوایی بەپێی پێویستیەكانی، سۆزەكانی، ئارەزووەكانی، ئاكاری، بەدوو وشە رێك خستن ئەویش ژیان‌و مردنی بوو، دواجار حەكیم واتای ئەوەی عەقڵ بێت گەر بەدەنی نەبێت ئەوا دەروونی عاقڵ دەبێت، ئایا فەیلەسوفێكی تر هەیە باشتر لەسوكرات بتوانێ وەڵامی ئەو پێناسەیە بداتەوە؟ لەوەش خۆمان بەدوور ناگرین كە

فەلسەفەکەی بۆ بەختیاری هەڵگری توخمە راستیە هەمیشەییەکانە، بەراستی زۆر راستگۆیانە دەڵێ کە بەختیاری پێویستی بەدەروون پاکی هەیە، ئەوەش راستە کە دەروون پاکی سێ مەرجی پێویستە کە بێ ئەم سێ مەرجە نابێ:-

١ـ مرۆڤ خۆی ناخاتە نێو دۆخێکەوە کە رقی لەخۆی بێتەوە وەك سەرپێچی کردن بۆ ئەو شتەی کە دەبێ رێزی لێ بگیرێ.

٢ـ مرۆڤ سازگاری بکات لەنێو ئارەزووەکانیدا، لەبابەتەکانو ژمارەکانیدا و رەوشی ژیانیشدا.

٣ـ دەبێ مرۆڤ بەوە رازی بێ کە دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێ و وەك بڕیارێکی خوداوەندی رەزامەندبێ پێی، یان لەقەدەرەوە بێت. هەروەك چۆن هەموو حەکیمە گەورەکانی سەردەمی نوێ و کۆن ناویان لێ ناو رای خۆیان کۆکردەوە بەشێوەیەکی روون دەربارەی ئەو فێرکردنە، لای رۆژهەلاتیەکان هەمان شێوە دەبینین: وەك (ساکیامونی) ئەو کەسەی کە ئارەزوو بەهۆ دۆزی هەموو ئازارێك دادەنێ و کونفوشیوس (کونغ ـ تسو) دەنوسێ و دەڵێ (حەکیم لەگەڵ رەوشی خۆیدا دەگونجێ و ئارەزووی هیچ شتێکی دەرەکی خۆی ناکات) لەکۆندا ئەوە بەشێوەی پچرپچر دەبینین بەتایبەتی لای (ابیقور) لای ریواقییەکان لەسەردەمی نوێشدا لای (مونتانی)، (دیکارت)، (سبینوزا)، (لابرویر)، (دهولباخ)،(شوبنهاور) کە لەکتێبەکەیدا بەناوی (نمونە دەربارەی حیکمەت لەژیاندا) بەکورت کراوی باسی لێوە دەکات. لەم دوایی یەشدا (میترلینك) لەکتێبی (حیکمەتو چارەنوس) جەختی لێ دەکاتەوە، ئەم حەقیقەتە نەوە دوای نەوەی گرتەوە وەك ئەو ئاڵتونەی کە ناگۆردرێ و هەر بەئاڵتونی دەمێنێتەوە، ئەوانەی کە خۆ بەخۆ لەنوسراوەکانیاندا

گوزارشتیان لێ دەكرد یان بەهۆشیاری یان بەبێ هۆش دەیانخوێندەوە ركابەری سوكراتیان دەكرد یان لەگەڵ سوكراتدا بوون، یان قوتابی سوكرات بوون، شانسیان هەبوو بەهۆی ئەوەوە نەمردن بەڵكو سوكرات بەهۆی ئەوەوە مرد ، سوكرات چووە ناو ئەفسانەوەو بووە ئەفسانە، ئەو ئەفسانەیەی كە ئەفلاتۆن سیما سەرەكیەكەی كێشاوە، لەبەر ئەم هۆیەش (ئازاری) سوكرات مایەوەو بووە (ئازاری) پیاوێك كە لەلای هەمووان بووە پاڵەوانێكی دروستكەر، قوربانی داو نەدەبوایە ئەوەی بەسەر بهاتایە: گاڵتەجاری بەردەوام بوونی بەخوداوەند.

# دوو گوڵبژێر لەگوتەکانی سوکرات

دوو گوڵبژێر هەڵدەبژێرین لەگوتەکانی سوکراتی دانا یەکەم بۆچوونی سوکراتە بەرامبەر سەفسەتائیو گوڵبژێری دووەم بەرگری یەکەیەتی لەکاتی دادگایی کردنیدا.

١ـ رای سوکرات دەربارەی سەفسەتائی:ـ

ها...ئەیبکرات دەڕۆیت بۆ لای بروتاگواسو پارەی دەدەیتێ بۆ ئەوەی فێری شتێکت بکات؟ بەڵام بۆچوونت دەربارەی بروتاگوراس چی یە؟ ئەیبقراط کوس گەر بچیت بۆ لای ئەوەی لە (اسکولاب)ەوە ناوتی هاڵگرتووەو پارەی بدەیتێ، هەر کەسێك هاتو پرسیاری لێ کردیت، جوانی لەپێدانی ئەو برە پارەیەدا چی یە؟ چۆن چۆنی وەڵامی دەدەیتەوە؟

ـ وا وەڵامم دەدایەوە کە ئەوە بۆ جوانی پزیشکی یە ـ بۆ ئەوەی ببیتە چی؟ بۆ ئەوەی ببیتە پزیشك، گەر بچیتە لای بولیکلیت ارگوس یان بۆ لای (فیدیاس)ی ئەسینیو بۆ فێربوونی زانست پارەی بدەیتێو لەگەڵ ئەوەشدا پرسیارت لێ بکاتو پارە نەدەیت بەبولیکلیتو فیدیاس ئەوا چۆن وەڵام دەدەیتەوە؟

ـ وا وەڵامم دەدایەوە ـ لەپێناو پەیکەرتاشیدا ـ بۆ ئەوەی ببیتە چی؟ بۆ ئەوەی زۆر بەرروونیو ئاشکرا ببمە پەیکەرتاش ـ زۆر باشە! کەواتە ئێستا هەردووکمان پێکەوە بۆ لای بروتاگواس ئامادەین هەر شتێك داوا بکات بیدەینێ لەپێناو فێرکردنتا، هەموو ئەو پارەیەی هەتە گەر بەشی کارو پێداویستی یەکانت بکات؟ گەر وا نەبێت

ئەوا چى پێويستە بۆ هاورێكانمان بەكارى دەهێنين، گەر يەكێكيان ئەو بايەخە گەورەيان تێبينى كرد پرسيارمان لەسوكراتو ئەيبقراط كرد پێم بلێن بەدانى ئەو هەموو پارەيە بەبروتاگوراس، بەبۆچوونى ئێوە بە چ مرۆڤێكى دەدەن؟ چۆن وەلاممان بدايەتەوە؟ ئەو ناوەى كە (پرۆتاگوراس)ى پێ دەناسرێ چى يە، ناوى (فيدياس)مان بەپەيكەرتاش دەناسىو ناوى هوميرس بەشاعير دەناسى؟ چۆن (بروتاگوراس)مان ناو دەنا؟ بروتاگوراسمان بەسەفسەتائى ناو دەبرد، باشە سوكرات ئەوا پارەكەمان دەدەينە سەفسەتائيەك، گەر پرسيارى لێ كرديت دەبيتە چى لەگەڵ بروتاگوراسدا؟ ئەيبقراط وەلام دەداتەوەو رووى سوور هەڵگەڕا (لەبەر ئەوەى تيشكى خۆر بينينى رووى دامێ) گەر بمانەوێ لۆژيكيانە بين ئەوا روونە بۆمان ببينە سەفسەتائى، بەناوى هەموو خوداوەندەكانەوە چۆن ئەمە دەبێ شەرم لەوە ناكەين كە خۆت وەك سەفسەتائيەك دەرخەيت لەبەردەم يۆنانيەكاندا؟ بەلێ - بەزفس قەسەم ئەى سوكرات، گەر راستيت بووێ شەرمەزار دەبم لەوە، ئە - ئا...ئەى ئەيبقراط لێت تێ دەگەم، مەبەستت ئەوەيە كە چوون بۆ قەتابخانەى بروتاگوراس وەك ئەوەيە كە بچين بۆ قوتابخانەى پەيكەرتاشى يان پزيشكى وەك ئەوەى بچين بۆ قوتابخانەى نەحوى يان يارى وەرزشەوانێكى دار. يان مامۆستاى مەشق، هەرخۆت نەچوويت بۆ لاى ئەو هەموو مامۆستايانە بۆ ئەوەى پيشەى مامۆستايى فێربيت. بەلكو چوويت بۆ ئەوەى تەنها مەشق بكەيتو فێرى ئەوە بيت كە شايستەى مرۆڤێكى ئازاد بێت، ئەمەوايە، مەبەستى چوونم بۆ بروتاگوراس ئەوەيە، بەلام ئايا دەزانيت چۆن بەو كارە هەستيت؟ چۆن، خۆت لەبەرامبەر سەفسەتائيەكدا وون دەكەيت، گرەو دەكەم تۆ نازانيت سەفسەتائى ماناى چى، لەبەرئەوەى كە تۆ نازانيت ماناى چى يە، ئەوەش

نازانیت گەر لەبەرامبەر كەسێكی چاكەخواز یان كەسێكی خراپەخواز بیت خۆت بدەیتە دەست كامیان، من چاك ئەوە دەزانم، باشە پێم بڵێ سەفسەتائی مانای چییە؟ سەفسەتائی هەروەك چۆن ناوەكەی خۆی بەخۆیەوەیەتیو شاهێدی دەدات، پیاوێكە هەزار شتی جوان دەزانێ ـ دەتوانین ئەو وەسفە بەرامبەر وێنەكێشێكو ئەندازیارێك بڵێین، ئەو كەسانەشی شتی زۆر جوان دەزانن، گەر پرسیارمان لەكەسێك كرد كە چی دەربارەی ئەو شتە جوانانە دەزانێ، پەشیمان نین لەوەڵام دانەوەی دەربارەی ئەو مەبەستانەی كە هزری وێنەكێش هەیەتی، گەر پرسیارمان لێ كرا سەفسەتائی چییە، بە چ جۆرێك وەڵام دەدەینەوە؟ بەجۆرێكی ووردتر ئەو شێوە هونەرە چی یە كە دەكرێتە پیشە، دەربارەی ئەوە چ دەڵێین، چالاكی یەكەی وای لەخەڵكان كرد بەجوانی داهێنەر بن لەهونەری قسەدا، لەوانەیە راستیو حەقیقەت بڵێین، بەڵام ئەوە هەموو شتێ نیە، وەڵامەكەت پرسیار دەوروژێنێ، ئەو شتانە چین وامان لێ بكات كە سەفسەتائیەك شارەزاتر بێ لەگفتوگۆ كردنیدا، ئایا مۆزیكازانێك، قوتابییەك خۆی فێری شارەزایی قسە كردن ناكات، بۆ نمونە یاری كردنی دار؟ ئەمە شتێكی راستە، لە چ بوارێكدا سەفسەتائیەك قوتابییەكی خۆی فێری شارەزایی قسە كردن دەكات؟ تەنیا لەو بوارەدا نیە كە دەیزانێ فێری ئەوانی تریشی دەكات؟ سوكرات بەراستی ناتوانم پێتی رابگەیەنم ـ كەواتە چۆن؟ هیچ مەترسیەك نابینی كە خۆت بخەیتە بەردەم مەترسی یەوەو ناچار بیتو بەدەنی خۆت بخەیتە بەردەم دەستی پزیشكو ئەویش دەتوانێ ئازار یان سوودت پێ بگەیەنێت ئایا هەزارجار زیاتر سەیری بابەتەكە ناكەیت؟ ئایا كەسوكارو هاورێكانت داوا ناكەیت بۆ ئەوەی گوێ رادێری بۆ پێشنیارەكانیانو لەگەڵیاندا

بکەویتە گفتوگۆ، یەکەجار رۆژێکی دوورو درێژ دەبەیتە سەر بۆ بڕیاردان؟ کاتێکیش مەسەلەکە پەیوەندی دەبێت بەخۆتەوە، ئەوەی زیاتر لەبەدەنتە رێزی لێ دەگریت، کە خۆت باوەڕت پێیەتی‌و کاریگەری دەکاتە سەر خۆشی‌و ناخۆشیت ئەمەش بە پێی باشی‌و خراپەی، مەپارێزەوەو داوای کات مەکە نە لەباوکت‌و نە لەبراکەت‌ونە لەکەسێك لەئێمەو نە لەهاوڕێکانیشت، چرکەیەك بەفیڕۆ نادەیت بۆ بڕیاردانی ماڵئاوایی کردن لەو کەسە نامۆیەی کە پێش کەمێك گەیشتۆتە جێ، بەڵام هەر کە زانیت دوای درەنگە ئێوارەیەك گەیشتۆتە جێ، هەر بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵاتندا بێ دوو دڵی خۆتی پێ دەسپێریت. زۆر بەئامادەباشیەوە ئەوەی هەتەو نیتەو ئەوەشی هاوڕێکانت هەیانە دەیخەیتە خزمەت ئەو کەسە، واشی دادەنێی کە کێشەکە کۆتایی پێ هاتووە، بەوەی کە خۆت بدەیتە دەست بروتاگوراس کە بەهیچ شێوەیەك نایناسیت، ئەمەش بە پێی بڕیاری خودی خۆت دەیکەیت‌و بەهیچ شێوەیەك گفتوگۆت لەگەڵدا نەکردووە تەنیا بە سەفسەتائیەك ناوی دەهێنیت، لەهەمان کاتدا دەتەوێت خۆتی بدەیتە دەست‌و تەنانەت بێ ئەوەی بزانی سەفسەتائی چی‌یە، سوکرات وەك خۆت دەڵێی ئەمە بەباشی دەردەکەوێ، ئەیبقراط پێم بڵێ سەفسەتائی شت فرۆشە، گەر شت فرۆشتنەکەی دەست فرۆشی بێت یان لەشوێنێکی جێگیردا بێت وەك دوکاندار شت بفرۆشێت. فرۆشگای خواردەمەنی کە دەروون پێی تێر دەبێت؟ بەزانست، ئەی ئازیزم دەبێت زۆر ئاگاداری خۆمان بین لەو سەفسەتائیانەی کە ستایشی کەل‌وپەلەکەی دەکات، ئەو هەڵماندەخلەتێنێ هەروەك چۆن خەڵکان بۆ فرۆشتنی شتە پێویستیەکانی لەشمان لەخۆراکدا هەڵماندەخلەتێنن، ئەوانە بێ شارەزایی خۆراك‌و خواردەمەنی کە دابەشی دەکەن

خراپ بێو خراپ نەبێت ئەوا بەشێوەیەك زۆر ستایشی دەكەن تەنیا بۆ ئەوەی بەباشی بیفرۆشن، ئەوانەشی دەیكڕن شارەزانین لەسیفەتی خواردنەكان هەروەك دوكاندارەكە وان. ئەمەش شێوەی حاڵی ئەو بازرگانەیە كە لەشارەكاندا زانست دەفرۆشن بەو كەسەی كە ئارەزووی زانستی هەیە؟ ستایشی ئەو شتانە دەكەن كە دەیفرۆشن ئەمەش بەبێ جیاوازی، زۆربەشیان شارەزای ئەو كەلوپەلانە نین كە دەیكڕن ئایا خراپە یان باشە بۆ دەروون؟ كڕیاریش گەر كەسێكیان تیا هەڵنەكەوێ كە شارەزایی نەبێ لەدەروونناسیدائەوا لەهەمان حاڵەتدان، ئازیزم ئەبیقراط گەر زۆر بایەخ بەو شتە بدەیت دەبێ ئاگاداری خۆت بیت، ئەوا دەبێت ئەو شتەی كە لەدنیادا زۆر لات خۆشەویستە بیبەخشی لەبەر ئەوەی مەترسی كڕیاری زانست لەمەسەلەی كڕینی خواردنو خۆراك بالاترە، بەهیچ شێوەیەك ناتوانین زانست بخەینە هیچ كەشتی یەكەوە تەنیا كەشتی دەروون نەبێ، حاڵی كڕیارو دانی نرخەكەیو قبوڵ كردنی ئەو كەلوپەلانە لەدەرووندا یان خێری پێوە دەبێت یان شەڕ چارەش نیە بۆ دانەوەی.

(ئەفلاتۆن، بروتاگوراس)

# دوا گوتاری سوكرات لەبەردەم دادوەراندا

ئەی ئەسینیەكان بەهۆی دەست لەدانی ئارامیتان سەیركەن چیتان پێ دەڵێن؟ بەهۆی سوكراتی حەكیمەوە سەرزەنشت دەكرێن، ئەوانەی هەوڵ دەدەن كە ناوبانگی شارەكەمان بزڕێنن، لەبەر ئەوەی بۆ شەرمەزار كردنی ئێوە پێتان دەڵێن من حەكیم بووم، لەگەڵ ئەوەشدا من وانیم، گەر ئێوە كەمێك ئارامتان هەبوایە یان چاوەڕێتان بكردایە، ئەوا مردن لەخۆوە دەهات، ئێوە تەمەنم دەبینن و بە ساڵا چووم و لەمردن نزیك بوومەتەوە، ئەم قسانەم ڕووبەڕووی زۆرتان ناكەمەوە بەڵكو ڕووبەڕووی ئەوانەی دەكەمەوە كە بڕیاری مردنیان بەسەردا داوم، بۆ ئەو كەسانەی هێشتا قسەم هەیە بۆیانی بڵێم، ئەی ئەسینیەكان ئێوە پێتان وایە هۆی سزادانم ناتەواوی بووە لەقسە كردنمدا، ناتەواوی بووە دەربارەی ئەو گوتارانەی كە بەهۆیەوە قەناعەتتان پێ دەكەم، ئەركە لەسەرم كە هەموو شتێ بكەم و هەموو شتێ بڵێم بۆ ئەوەی لەو سزایە دەرچم، نەخێر، بەهیچ حەقێك، سزاكەم لەبەر كەم دوویی نەبووە لەقسە كردنمدا، بەڵكو لەبەر نەبوونی ئازایەتیمە، من نەمویستووە ئەوەی پێتان ناخۆش بێت باسی بكەم، بەڵكو ئێوە بەو ئاواتەوە بوون بۆ ئەوەی سوكرات بەسلاوێكی بەبۆڵە بۆڵەوە ببینن، كە هەندێ شت بكات و هەندێ شت بڵێ كە نەگونجێ لەگەڵمدا، شتتان بۆ دروست كردم كە لەهەندێ تاوانبارانی ترەوە گوێتان لێ بوو بەڵام ئەوەی لەپێشودا بینیم هەست كردنە بەمەترسی دەبێ ئەو كارانە بكەم كە شایستەی مرۆڤێكی ئازادە. ئەی بۆ نا، ئێستا تووشی پەشیمانی بووم لەبەرئەوەی بەو شێوەیە بەرگریم لەخۆم

کردووه، مردنم پێ باشتره دوای ئەوەی بەرگریم لەخۆم کرد نەك بەو شێوەیە بژیم، لەبەرئەوەی لەدادگاکانداو لەجەنگیشدا بۆ هیچ مرۆڤێك نیە نەبۆ منو نەبۆ هیچ کەسێکی تریش کە خۆی لەمردن رزگار کات، لەجەنگدا زۆر هەن دەتوانن چەکەکانیان فڕێ دەنو داواکارن بچنە لەشکری دوژمنەوە، لەهەموو مەترسی یەکدا بەهەمان شێوەیە، خەڵکان هەزار جۆرە کەرەستە دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لەمردن، دەتوانن هەموو شتێ بکەن یان هەموو شتێ بڵێن، بەڵام ئەی ئەسینیەکان رزگار بوون لەمردن زەحمەت نیە، گرانو زەحمەتترە لەنەهێشتنی شەڕ، خێراترە لەمردن، لەحاڵەتی ئێستادا من لەسەرخۆو بەتەمەنیشدا چووم کامیان لەسەرخۆترە لەوی تر، بەڵام ئەوانەی کە تاوانباریان کردم زۆر بەهێزو زمان لوسن تووشی خێرایی یەکی زۆر بوون، تووشی شەڕ بوون، ئێستاش من لێرەوە دەدەچمو لەلایەن ئێوەوە سزا دراوم ئەوانیش بەناوی حەقیقەتەوە بڕیار دراوە بەسەریاندا کە پیاو خراپو تاوانبارن من سزاکەم وەردەگرمو ئەوانیش سزاکانیان وەردەگرن، لەوانەشە وا پێویست بووبێت ئەوەی رووی دا ابایە، وابزانم مەسەلەکان دەبێ وابێ هەروەك خۆی چۆنە وابێ، دوای ئەوە ئارەزوو دەکەم کە پێشبینی ئەوەتان بدەمێ کە خەڵکان دەتوانن ئایندەی خۆیان بخوێننەوە، کەواتە ئەی دادوەران لەچرکەساتی دەرچوونی ژیان لەبەدەنم پێشبینیتان بۆ دەکەم کە دوای مردنم مل کەچ دەبن وەك سزایەك لەلایەن (زفس)ەوە، بێزاری دەردەکەوێ بەوەی بەسەر منتاندا هێنا، ئێستا بەکوشتنم بڕیارتاندا بەو هیوایەی کە رزگارتان بێت لە لێپرسینەوەی ژیانتان. من بۆتانی دووپات دەکەمەوە کە ئەوەی روو دەدات لێتان پێچەوانەکەیەتی، ژمارەی ئەو خەڵکە ئۆپۆزسیۆنانە دەبینین کە گرتوتانە تا ئێستا

لەزیادبووندایە بێئەوەی ئاگادار بن، لەبەرئەوەی گەر ئێوە بەكوشتنی خەڵك وای بۆ بچن كە ژیانی گەندەڵتان لەپڕ بگۆڕدرێ ئەوا ئێوە بەهەڵەدا دەچن، ئەو ڕێگایەی بەكارتان هێناوە بۆ ئەوەی رزگارتان بێ لەرەخنە ئەوا ڕێگایەكی بەجێ نیە، بەلاّم جوانترین ڕێگاو ئاسانترین ڕێگا ئەوەیە خۆتان تەئدیب بكەن لەبری ئەوەی دەمی خەڵك ببەستن، ئەوەی دەتوانم ئەو پێشبینیانەیە كە دەمویست پێتانی رابگەیەنم، ئێوە بڕیارتان دا بەسەرما، دەشێ بڕۆمو لای ئێوە بەجێ بهێڵم بەلاّم دەربارەی ئەوانە كە بێ تاوانی منیان راگەیاند دەمەوێ لەم ساتەدا قسەتان لەگەڵدا بكەم، بەلاّم دادوەران سەرگەرمی كارن، نامگەیەنێتە ئەو شوێنەی كەوا تیایدا دەمرم، كەواتە ئەی هاوڕێیان چاوەڕێم كەن تا ئەو كاتە، هیچ شتێك بەربەست نابێ بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ یەكتردا بكەین چونكە كاتمان زۆر بەدەستەوە ماوە، دەمەوێ وەك هاورێیەك ئەوەتان بۆ دەربخەم كە چۆن چۆنی بتوانم ئەوەی ئەمڕۆ رووی دا بۆتانی راڤە بكەم، ئەی دادوەران لەراستیدا لەبەرئەوەی ئێوە شایستەی نازناوی دادوەرن لەژیانمدا شتێكی نامۆ رووی دا، بەردەوام ئەو دەنگە خوداوەندیەی كە دام هێنا قسەم لەگەڵدا دەكردو گوێم لێ دەگرت تەنانەت بۆ هەندێ كاری بچوكی بێ بایەخیش، با رووبەرووم بێتەوە گەر بۆ كارێكی خراپە ئامادە بوبێتم، بەهەر حاڵ ئەوەی كە ئەمڕۆ رووی داهەروەك خۆتان دەیبینن شتێكە كە دەتوانین بەبچوكترین خراپە دابنێین، كە ماڵم بەجێ هێشت سروشی خوداوەندی ئەم بەیانیە رووی نەگرتمو هەروەها كاتێكیش هاتمە نێو هۆڵی دادگاشەوە رووی نەگرتم هەروەها لەهەر چركە ساتی گوتارەكەشمدا رووی نەگرتم، هەرچەندە ئەوەی دەمویست بیڵێم لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێ بارودۆخی تردا لەنیوەی ڕێگادا رای دەوەستانم ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە

لەكاتی گفتوگۆكەدا خۆی نەهێنایە نێو مەسەلەكەوە، بۆ ئەوەی دژایەتی كردەوەیەكم یان ووشەیەكم نەكات، كەواتە ئەو قەوارەیە بۆ چ چاكەیەك دارێژم، پێتان دەڵێم ئەوەی رووی دا ئەوا لەبەرژەوەندی من بووە، ناتوانین بەرێگایەكی تەندروست بڕیار بدەین كە مردن خراپەیە، ئەوا لێرەدا بەڵگەیەكی گرنگ دەبینین، لەبەرئەوەی سروشی داهێنراو رووبەرووم نەبۆوە گەر ئەوەی پێی هەڵدەستام ئەوا دژی خۆم دەبوو، ئەمەش ئەو پاساوانەی ترن كە وا دەكەن مردن خێری پێوە بێت، لەم دوو شتە یەك مەبەست هەیە، ئەوەی كە دەمرێ دەگۆڕدرێ بۆ عەدەم دوای ئەوە هۆشی شتەكان وون دەكات یان ئەوەتا هەروەك دەڵێن مردن جێ گۆڕكێیە كۆچ كردنی دەروونە بۆ ئەو جێگایەی كە خۆی بۆی دەچێ، گەر مردن كوژاندنەوەی ئەو هەموو سۆزە بێت، ئەوا لەو خەونە قوڵە دەچێ كە هیچ شتێكی تیا نابینین، تەنانەت لە خەون بینیندا دەسكەوتێكی سەیرە كە دەمرن، گەر ناچار بین بەوەی شەوێك لەو شەوانە هەڵبژێرین و خۆمان بدەینە دەست خەوێكی زۆر قوڵی بێ خەونەوەو هاوتای كەن لەگەڵ شەوان و رۆژانی تردا گەر بپشكنین دەتوانین بڵێین بە چ شێوەیەكی خۆش ئەو شەوو رۆژانە ژیاون زیاتر لەو شەوە، وای بۆ دەچم كە نەك خەڵكانی سادە بەڵكو پادشا خۆی بەلایەوە ئاسان نیە ئەو شەوو رۆژانە هاوتا بكات و بیانژمێرێ، گەر مردن هاوشێوە بێ بەوە ئەوا رای دەگەیەنم كە سەركەوتنە، لەبەر ئەوەی هەموو بەدواداچونێكی زەمەن تەنها یەك خەوتنە، لەلایەكی ترەوە گەر مردن پەڕینەوەیەك بێت لەم دنیایەوە بۆ شوێنێكی تر، گەر راست بێت هەروەك دەوترێ هەموو مردوان لەو شوێنەدا كۆدەبنەوە، ئایا ئەی دادوەران دەتوانین وای بۆ بچین كە گەورەترین چاكەیە؟ لەبەر ئەوەی لەكۆتاییدا وای پێویست كرد هەر

بەگەیشتنمان بەدۆزەخ دوای ئەوەی رزگار دەبین لەوانەی ناوی خۆیان ناوە دادوەر لەدۆزەخدا دادوەری حەقیقی بەدی بکەین، ئەوانەی کە بەیەکسانو دادوەر بەناوبانگن وەك، مینوس، رادامانت، ایاك، تریبتولیم، هەموویان لەژیاندا دادپەروەر بوون کە وابێ بۆ ئەو سەفەرە تاڵە نەگرینەبەر؟ لەولاشەوە لەگەڵ، اورفی، موزی، ایزیود، هومیروس، کۆدەبینەوە، کە وابێ بە چ بەهایەك ئەو بەختیاریە بکڕین؟ بەڵام من هەموو کاتێك ئەو مردنە پەسەند دەکەم، گەر ئەم ریوایەتانە راست بن، ئا، بەشێوەیەکی تایبەت دەربارەی خۆم چ سات و کاتێکی خۆشە لەوێ لەگەڵ (بالامید) و (تاجاکس)ی کوڕی تیلامون گفتوگۆ بکەم. هەروەها لەگەڵ هەموو ئەو پاڵەوانانەی کە لەسەردەمە کۆنەکاندا بەهۆی بڕیاری دادگا ستەمکارەکانەوە مردن، وای بۆ دەچم کە کەمێ جیاوازی بەدی بکەم بۆ چارەنوس و چارەنوسی ئەوان لەمەش چێژێك وەردەگرم بەڵام چێژی کەمم ئەوەیە کە کاتی خۆم بەپرسیار کردن بەسەر بەرم لەگەڵ جێنشیندا. هەروەك چۆن لێرە پرسیارم دەکرد، بۆ ئەوەی بەدی بکەم کێ حەکیمە تیایانداو کێ دەیەوێ رۆڵی حەکیم بگێڕێو خۆی بە حەکیم بزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا وانین و خۆیان بەحەکیم سەیر دەکەن، ئەی دادوەران بەچی ئێرەیی بەرین، بەرامبەر ئاراستە کردنی ئەو پرسیارەی کە رووبەرووی ئەو کەسە بکرێتەوە کە لەشکرێکی گەورەی راپێچ کرد دژی تەڕوادە، یان بەرامبەر (الیس) یان (سیزیف) یان خەڵکانی تر، پیاوو ژن، دەتوانین ناوەکانیان بڵێین؟ قسە کردن لەگەڵیاندا ژیان بەسەر بردن لەگەڵیاندا، تاقی کردنەوەکانیان، هەموو ئەو شتانە خۆشیو چێژەو وەسف ناکرێ، بەهەرحاڵ لەدۆزەخدا بڕوامان هەیە کە بەهۆی گفتوگۆوە سزای مردن نادرێ بەسەرماندا بەهەموو شێوەیەك زۆر بەختیارین لێرە،

نەمر دەبین گەر ئەو قسەیە راست بێت، هەروەها ئێوە ئەی دادوەران، دەبێ لەبەردەم مردندا وەك پیاوێكی چاك خۆتان دەربخەن‌و شتێك بخەنە مێشكتانەوە ئەویش ئەوەیە كە خراپە ئێخەی پیاو چاك ناگرێ نە لەژیانداو نەدوای مردنی، خوداوەندەكانیش بایەخ دەدەن بەچارەنوسی، چارەنوسم دروست كراوی رێكەوت نیە، بەروونی ئەوە دەبینم كە باشتر وایە بمرم لەم ساتەداو لەهەموو ئازارێك رزگارم بێت، لێرەوە دەردەكەوێ كە سروش ئێخەی نەگرتم لەهەر چركەیەكداو بەرق‌و كینە نیم لەو كەسانەی كەسزایان داوم‌و ئەوانەشی كە تاوانباریان كردم، راستە ئەوان بەبڕیاردان لەسەرم‌و تاوانباركردنم جیاواز بوون دەربارەی من وایان دەزانی كە خراپەم پێ دەكەن هەبۆیە لۆمەیان دەكەم لەگەڵ ئەوەشدا داواكاریەكم هەیە لێیان، كاتێك منداڵەكانم گەورە دەبن ئەی ئەسینیەكان سزایان بدەن وەك چۆن من سزاتانم دەدان‌و ئازارتانم دەدا، گەر بینیتان دوای سەروەت‌و سامان دەكەون یا شتێك كە لەپێش فەزیلەتەوە بێت‌و بزانن شتێكی بە نرخە سەرەڕای ئەوەی ئەو شتانە هیچ نین ئەوا شەرمەزاریان بكەن هەروەك چۆن شەرمەزارم دەكردن، لەبەرئەوەی ئەركی خۆیان جێبەجێ نەكردووە، ووریایان بكەنەوە لەكاتێكدا بێ فەزڵ بوون گەر واتان كرد ئەوا بەدادپەروەری مامەڵەتان لەگەڵ من‌و منداڵەكانمدا كردووە، ئەمەش دوا ساتی رۆشتنە من بۆ مردن‌و ئێوەش بۆ ژیان كێ بەشی چاكەی پێ دەبڕێ كەس ئەوە نازانێت تەنیا خوداوند نەبێت.